# خوو پێوەگرتن بە مادده هۆشبەرەکان

## هۆکارەکان و ئاسەوارەکانی

لێکۆڵینەوەیەکی تیۆری و مەیدانییە لە سەر خووگرە بەندکراوەکان لە هەولێر

**فائیز ئیبراهیم محەممەد**

**هەولێر 2007**

ناوی کتێب: خۆ بەدوورگرتن لە ماددە هۆشبەرەکان

نووسینی: فائیز ئیبراهیم محەممەد

نەخشەسازی ناوەوە: هەردی

بەرگ: ئاسۆ مامزادە

ژمارەی سپاردن: ( 1374 )

تیراژ: ( 750 ) دانە

چاپی یەکەم 2007

نرخ: ( 1000 ) دینار

چاپخانە: چاپخانەی خانی

زنجیرەی کتێب ( 25 )

بســم الله الرحمـن الرحيـم

((ولا تلقوا بأيديكم الى التهلكة و أحسنوا))

**((خۆتان بە دەستی خۆتان مەخەنە نەهامەتی و کاری**

**باش بکەن))** (البقرة/195)

# پێرست

# پێشەکی

لە سەردەمێکدا دەژین کە زۆربەی کۆمەڵگاکانی جیهان لە دوو ڕەوتی تاوانبار - بە فورمی ڕێکخراو و ناڕێکخراو - وەکو دوو هۆکاری بەهێزی تێکدەری بونیادی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگاکان بە هەموو بەشەکانەوە دەناڵێنن کە پێم وایە هەردووکیان بە هۆی هەبوونی یەك مەبەست و یەك ئاراستەی ئێگەتیڤی هاوبەش، دوو گیانن لە یەك جەستەدا، کە بریتین لە: ((ڕەوتی تیرۆریزم)) و ((ڕەوتی مادده هۆشبەرەکان)).

کێشەی مادده هۆشبەرەکان ـ وەکو کێشەی تیرۆریزم، نە بەڵکو زیاتر لەوە ـ یەکێك لە گرنگترین کێشە و دیاردەکانە، کە سەرنجی زۆر لە زانایان و توێژەران و دەستە نێوخۆییەکان و جیهانی ڕاکێشاوە و بۆتە بابەتێکی سەرەکی و گرنگ لە توێژینەوەکانی کۆمەڵایەتی، دەروونی، سیاسی، ئابووری، فەرهەنگیدا.

ئەوەی کە ئێمەی هاندا بۆ توێژینەوەی ئەو کێشەیە، دوو پاڵنەری سەرەکی بوون:

1- هەستی نەتەوایەتی: لە دوای ڕزگاربوونی هەرێمی کوردستانی عیراق کە لە ئەنجامی خەباتێکی دوورودرێژی گەلەکەمان دژی ڕژێمی بەعس و دوژمنانی ترمان، پێدەچێت کۆمەڵگای کوردەوارمان، تا ڕادەیەك بەرەو سەقامگیری و هێمنی بچێت، ئەگەرچی کوردستان لە ژێر گوشاری دوژمنان ـ تارادەیەك ئەویش لە ڕووی سەربازییەوە ـ ڕزگار بووە، بەڵام هێشتا ئاسەواری ناڵەباری سەردەمی فەرمانڕەواییان ماوەتەوە، وەکو: هەژاری، نەزانین، خورافات، نەخۆشیە جۆراو جۆرە دەروونی و کۆمەڵایەتییەکان. کە ئەمانە میراتی هەمیشەیی هەموو ڕژێمێکی دیکتاتۆری و ستەمکار بووە و دەبێت.

جگە لە کێشەی تیرۆر کە لە دوای ڕزگار بوونی کوردستان زۆر پەرەی سەندووە ـ و توێژینەوەی زۆریش لەسەری کراوە ـ تووشی کێشەی مادده هۆشبەرەکانیش بوە

و ماوەیەکە کە گوێ بیستی گرتنی هەندێ لە خووگرەکان و قاچاغچییانی ماددە هۆشبەرەکان دەبین، کە خەریکە وەکو دیاردەیەك لە نێو گەنجەکانی گەلەکەمان بڵاو دەبێتەوە، کە ئەوەش رەنگە پیلانێکی تری دوژمنان بێت!

بۆیە هەستی نەتەوایەتی ناهێڵێ کە بەرامبەر بەو دیاردەیە پڕ مەترسییانە بێ دەنگ بین و ئەم جارە دەبێ لە پێناو گەڕاندنەوەی بونیادی کۆمەڵگا و پاك کردنەوەی لە هەموو کێشەی توند و درێژخایەن و موزمن کە دەبنە کۆسپ و تێکدەر لە بەردەم گەشەکردن و پێشکەوتن و بەختەوەری نەتەوەکەمان خەبات بکەین.

2- هەست بە بۆشایی و نەبوونی دیراساتی پێویست، سەبارەت بەو کێشەیە کە پشت ببەستێت بە میتۆدی زانستی و ئاکادیمی کە ئەم دیراساتە دەبنە هۆی تێگەیشتنی زانستییانە و راڤەیەکی دروست و گونجاو لە هەموو لایەنەکانی ئەو کێشەیە لە ژێر رۆشنایی واقیع و ژینگەی کوردستان.

بەم پێیە ئەم باسەمان هەڵبژارد و هەوڵمان ئەوەیە کە تیشك بخەینە سەر ئەم دیاردەیە نامۆیە وەکو دیاردەیەکی دەروونی ـ کۆمەڵایەتی کە ئاسەواری نێگەتیڤی جۆراوجۆری هەیە، هەم لەسەر تاك و هەمیش لەسەر کۆمەڵگا و سیستەمەکانی.

ئەم لێکۆڵینەوە لە دوو لایەنی ((تیوری)) و ((مەیدانی)) پێك دێت کە هەریەك لەوانە چەند بەشێك دەگرێتەخۆی، بەم شێوەی خوارەوە:

**لایەنی تیوری: لە چوار بەش پێك دێت:**

یەکەم بەش باس لە چوارچێوەی گشتی لێکۆڵینەوە دەکات کە پێك دێت لە: ((کێشەی لێکۆڵینەوە))، ((ئامانجی لێکۆڵینەوە)) و ((گرنگی لێکۆڵینەوە)).

بەشی دووەم بریتیە لە پێناسەی چەمکەکان کە هەوڵمان داوە پێناسەی سێ چەمکی سەرەکی ((ماددە هۆشبەرەکان))، ((خووپێوەگرتن)) و ((خووگر)) لە روانگەی جۆراوجۆرەوە بکەین.

بەشی سێیەم بریتیە لە دەستنیشانکردنی هۆکارەکـان خووپێـوەگرتن بـە مـاددە هۆشبەرەکان، کە چەندین هۆکاری پێکەوە بەستراو دەگرێتەوە.

بەشی چوارەم بریتیە لە ئاسەواری خووپێوەگرتن کە باس لە کۆمەڵێك ئاسـەواری نێگەتیڤی ماددە هۆشبەرەکان دەکات هەم لە سەر تاکی بەکار هێنەر، هـەمیش لە سەر کۆمەڵگا بە گشتی.

**لایەنی مەیدانی، لە دوو بەش پێکهاتووە کە بریتین لە:**

بەشی پێنجەم کە باس لە رێوشوێنی میتـۆدی لێکۆڵینـەوە دەکـات کـە جـۆری میتـودی بـەکار هێنـراو و کۆمـەڵگای لێکۆڵینـەوە و ئـامرازی کۆکردنـەوەی زانیاریەکان و بوارەکانی لێکۆڵینەوە دەگرێتەوە.

بەشی شەشەم بریتیە لە خستنەروو و شیکردنەوەی زانیارییـەکان، کـە هـەر لـەم بەشەدا دەرەنجامەکان و پێشنیارەکان و چارەسەرییەکان باس کراون.

ئومێدمان وایە کە ئەم لێکۆڵینەوەیە وەکو هەنگاوێکی سەرەتایی بێت بۆ هەندێ هەوڵەکانی تر و دیراساتی بەرفراوانتر.

**فائیز ئیبراهیم محەمەد**

# دەروازەی یەکەم: لایەنی تیۆری

## بەشی یەکەم: چوارچێوەی گشتی لێکۆڵینەوە

1. کێشەی لێکۆڵینەوە

2. ئامانجی لێکۆڵینەوە

3. گرنگی لێکۆڵینەوە

# بەشی یەکەم: چوارچێوەی گشتی لێکۆڵینەوە

## 1- کێشەی لیکۆڵینەوە

کێشەی ماددە هۆشبەرەکان، تەنها کێشەی ئەو تاکەی کە بە کاری دەهێنێ نیە، بەڵکو کێشەیەکی چەند لایەنەیە کە پەیوەندی بە ((تاك)) و ((کۆمەڵگا))وە هەیە.

پێش هەموو شتێك، کێشەیەکی ((تەندروستی))یە کە پەیوەندی بە لایەنی ((سایکۆسۆماتیکی)) هەیە، واتە: کاری نێگەتیڤی دەکاتە سەر هەر دوو لایەنی جەستەیی و دەروونی تاکی بەکارهێنەر کە راستەوخۆ و ناراستەوخۆ کار دەکاتە سەر خێزان و کۆمەڵگاش بە گشتی.

هەروەها کێشەیەکی کۆمەڵایەتی بەهێزیشە و کار دەکاتە سەر پەیوندی کۆمەڵایەتییەکان و جۆرەها کێشە و گرفتی تر لێدەکەوێتەوە، وەکو: تێکچوونی خێزان، تەڵاق، هەژاری، بێکاری، دزی، خۆکوژی، کوشتنی ژن و منداڵ، قاچاغکردن و تووشی بەندیخانە بوون و...

کێشەی ئابووری، بەشێکی تری کێشەیەی ماددە هۆشبەرەکانە کە هەم بۆ تاك و هەمیش بۆ کۆمەڵگا گرنگییەکی زۆر هەیە.

هەروەها ئەوە کێشەی دەوڵەت و کۆمەڵگاشە.. چونکە کۆمەڵگا ناچارە لە جیاتی سەرمایەگوزاری بۆ جۆرەها پرۆژە و پلانی گرنگ و پەرەپێدان و گەشەکردنی کۆمەڵایەتی و ئابووری و فەرهەنگی و سیاسی و... هتد (وەکو: فێرکردن، تەندروستی، خزمەتگوزاری، پیشەسازی، بازرگانی، تووریزم و...)، لەسەر نەهێشتن و بەرەنگاربوونەوە وگرتن و دادگایی کردن و بەندکردن و

چاکسازی و چارەسەرییان خەرج بکات. ئەوەش بە راستی زیانێکی نەتەوەییە کە راستەوخۆ و ناراستەوخۆ کاری نێگەتیڤی دەکاتە سەر پرۆسەی پێشکەوتن و ئاستی داهاتی نەتەوەیی و ئاستی خۆشگوزەرانی و بژێوی تاکەکان!

مادده هۆشبەرەکان کێشەیەکی قانونیشە، چونکە قانونی زۆربەی ولاتان وەکو تاوانێکی گەورە دژ بە کۆمەڵگاوە دەزانن، هەم ئەوانەی کە بەکاری دەهێنن، هەم بازرگانان و هەمیش بەرهەم هێنەرانی ئەم مەوادە. بۆیە تووشی بەرەنگاری و روبەروبوونەوەی یاسا و سزای توندی کۆمەڵگا دەبن. تەنانەت لە هەندێك ولاتدا لە سێدارەدان و زیندانی ئەبەدیان بۆ داناوە.

کەواتە مادده هۆشبەرەکان تەنها کێشەیەکی تاکی نییە، بەڵکو چەندین لایەنی هەیە کە هەموو پێکەوە گرێدراون و هەر یەك لەو لایەنانە مەترسی لەسەر ژیانی تاك (واتە لە سەر ورە و چوونیەتی خوگونجاندنی لەگەڵ دۆخی خۆی و خێزان و کۆمەڵگاکەی) و هەمیش لەسەر ژیانی کۆمەڵگا و دەوڵەت و پێشکەوتن و گەشەکردنی وولات هەیە. بۆیە دەبێ تێروانینمان سەبارەت بەم کێشەیە، تێروانینێکی گشتگیر بێت، هەموو هۆکارەکان رەچاو بکەین، گرنگی بە هەموو لایەنەکانی ئەم کێشەیە بدەین، چونکە ئەم دیاردەیە زۆر مەترسیدارە، بە تایبەتی ئەگەر درێژە بکێشێ و چارەسەر نەکرێ. لەو کاتەدا زۆر زەحمەتە کونترۆڵی دۆخەکە بکرێ.. بۆیە ئەم بابەتەمان هەڵبژارد بۆ لێکۆڵینەوەکەمان و پێمان وایە ئەم دیاردەیە پێویستی زیاتر هەیە بە گرنگیدان و دیراسەکردنی.

## 2- گرنگی لێکۆڵینەوە

ئەگەرچی مادده هۆشبەرەکان و کێشەکانی شتێکی تازە نیە، بەڵام لەو سەردەمەدا بوتە کێشەیەکی مەترسیدار و زۆر ئالۆز کە زۆربەی ولاتانی دونیای گرتۆتەوە.

له روانگەی کۆمەڵگای نێودەولەتی، مادده هۆشبەرەکان و قاچاغکردنی مادده هۆشبەرەکان له تەنیشت سێ قەیرانی تری جیهانی سەیر دەکرێ: ((قەیرانی ئەتۆمی))، ((قەیرانی دانیشتووان)) و ((قەیرانی ژینگە)) (کە من ((قەیرانی تیرۆریزم))یش زیاد دەکەم) کە هەرەشەنە بۆ مرۆڤی ئەم سەردەمە. لە لایەکی ترەوە سەرمایە و داهاتی مادده هۆشبەرەکان (1500 ملیارد دولار له ساڵدا) لە روانگەی بازرگانییەوە لە دوای ((نەوت)) و ((گەشتیاری)) و ((چەك)) دێت[1].

هەلکەوتەی ستراتیژی کوردستان و دراوسێبوونی لەگەڵ ((ئێران)) کە گرنگترین وڵاتی ترانزیتی مادده هۆشبەرەکانە کە لە رێگایەوە مادده هۆشبەرەکان لە ئەفغانستان و پاکستان دەگوازرێتەوە بۆ وڵاتانی ئەوروپی، مەترسی ئەم کێشەیە دوو ئەوەندە دەکات! چونکە بووەتە هۆی قاچاغی مادده هۆشبەرەکان لە ئێران و دۆزینەوەی بازاڕ بۆ فرۆشتن و خەرجکردن هەم لە ناو ئێران و هەمیش لە دەرەوەی ئێران.

دیارە یەکێك لەو بازاڕانە کەوتۆتە ئەو دیوی سنور کە کوردستانی رۆژهەڵاتە، بە هۆی زۆری قاچاغچی، مەوادی هۆشبەر دەگوازرێتەوە بۆ فرۆشتن و سەرفکردن و بەکارهێنانی گەنجەکانی گەلەکەمان.

بە پێی ئاماری ((ئاسایشی گشتی هەولێر)) نزیکەی (700) خووگر لە ناو کوردستان مەزەندە دەکرێ و مەوادێکی زۆر وەکو: تریاك و هێرۆین و حەشیش لەوانە گیراوە![2].

((خووپێوەگرتن)) وەکو کێشەیەکی کۆمەڵایەتی، تەندروستی، ئابووری، فەرهەنگی، کار دەکاتە سەر ئاسایشی نەتەوەیی و هەموو دەستکەوتەکانی

1. هاشمی (د. علی): مواد مخدر: بحران اجتماعی و تهدید علیه امنیت ملی ـ ستاد مبارزه با مواد مخدر، تهران1382، ل 9.
2. له کاتی سەردان و چاوپێکەوتنمان لەگەڵ بەرپرسانی ئاسایشی گشتی هەولێر. لە رێکەوتی 10/ 4/ 2006.

گەلەکەمان. ئامارەکان نیشاندەدەن کە ژمارەی خووگرەکان لە کوردستان رۆژ بە رۆژ بەرەو زیاد بوونن. ئەو بابەتەش کە ((گەنجەکان)) زیاتر لە مەترسی تووش بوونی ئەم نەخۆشییەدان، ئەرکی هەموومان لە رووبەڕووبوونەوەی ئەم کێشەیە بەهێزتر دەکات!

گرنگی باسەکەمان لەوەدایە نیشانی دەدات کە ئەرکی تاك، خێزان، دایکان و باوکان، دەزگاکانی فێرکردن و پەروەردە، راگەیاندن... تا دەگاتە دەوڵەت، ئایا هەموو ئەو دەزگایانە بەرپرسیاریان لە بەرامبەر ئەم کێشەیە چیە؟.. ئایا ئەم کێشەیە بە گرتن و سزادان و غەرامەکردنی چەند کەسانێك کە ئەم کارە دەکەن، چارەسەر دەبێت؟ یاخود پێویستی بە ویست و عەزمێکی تاك تاکی ئێمە هەیە، لە هەر پۆست و لە هەر شوێنێك دا بین؟

ئەگەر بە شێوەیەکی زانستیانە پێشگیری لەو کێشە و دیاردەیە نەگیرێ، لە ئایندەیەکی دوور یان نزیك شایەدی زۆر لە کێشەکانی تر - یەك لە دوای یەك - دەبین کە بە راستی دەبنە کۆسپ و ئاستەنگی گەورە لە بەردەم پێشکەوتن و گەشەکردن لە هەموو بوارێك دا!

### 3- ئامانجی لێکۆڵینەوە

1. ئامانجی یەکەمی ئەم لێکۆڵینەوەمان، هەوڵ دانە بۆ زانینی دۆخی ئەم کێشەیە و رەگ و ریشە و مەودای بڵاوبوونەوەی لە کۆمەڵگەکەماندا.. ئەم دیاردەیە لە کوێ هاتووە و زیاتر لە کوێ بڵاو بوەتەوە و لەنێوان چ توێژ و چینێکی کۆمەڵگەدا زیاتر باوە؟!
2. ئامانجی دیکەی ئەم لێکۆڵینەوەیە، ئەوەیە کە هەوڵمان داوە بزانین رواڵەت و نیشانەکانی خووگرتن چین؟ تاکی خووگر چ جیاوازییەکی هەیە لەگەڵ تاکی سروشتی و ساغ؟
3. هەروەها پاڵنەرەکان و هۆکارەکانی تووش بوونیان بەو دیاردەیە چین؟ یان لە کۆمەڵگەکەماندا کام پاڵنەر زیاتر کاریگەری هەبوە لە سەریان؟

4. ئامانجی دیکە بریتییە لە: زانینی ئاسەوار و دەرەنجامەکانی ئەم دیاردەیە لەسەر تاك و کۆمەڵگا، ئایا تەنها ئاسەواری نێگەتیڤی لەسەر تاکی خووگر هەیە، یاخود جگە لە تاك، لە سەر خێزان و کۆمەڵگاش بە گشتی؟

5. ئامانجی ترمان بریتییە لە: دۆزینەوەی رێگای بەرەنگاربوونەوە و چارەسەری و پێشگیری لەم دیاردەیە کۆمەڵایەتییە.. وانە ئەرکی تاك و کۆمەڵگا و دەوڵەت چییە بەرامبەر بەو کێشەیە لە پێناو نەهێشتن - یان لایەنی کەم - کەم کردنەوەی رێژەکەی؟!

# بەشی دووەم: دەست نیشانکردنی چەمکەکان

1. چەمکی ماددە هۆشبەرەکان

2. چەمکی خووپێوەگرتن

3. چەمکی خووگر

## بەشی دووەم: دەست نیشانکردنی چەمکەکان

### 1- چەمکی مادده هۆشبەرەکان

بۆ چەمکی مادده هۆشبەرەکان چەندین پێناسەی جۆراوجۆر - لە روانگەی جۆراوجۆرەوە - هەیە کە لێرە ئاماژە بە هەندێ لەوانە دەکەین:

★ **مادده هۆشبەرەکان لە رووی زمانەوانیەوە:** بریتیە لەو مەوادانەی کە بە هۆیەوە تاك تووشی بێ هۆش و سرپوونەوە و هەست نەکردن بە شتی دەوروبەری دەبێت[3].

★ **مادده هۆشبەرەکان لە رووی پزیشکیەوە:** بریتیە لەو ماددەیە کە کار دەکاتە سەر کۆئەندامی دەماری تاك کە دەبێتە هۆی گۆڕان بە سەر هەندی ئەندامی جەستەی مرۆڤ کە ناتوانێ بە ئەرکی خۆی هەڵبستێ کە پێی دەگوترێ: ((کاریگەری فیزیولۆژی)). هەروەها دەبێتە هۆی گۆڕان لە هەندی توانایەکانی بە هۆی کارتێکردن لە سەر کۆئەندامی دەماری، وەکو: هەستکردن، قسەکردن، بیرکردنەوە، خەیاڵکردن و...[4]

★ **مادده هۆشبەرەکان لە رووی شەریعەتی ئیسلامیەوە:** زۆربەی زانایانی ئیسلام بە پشت بەستن بە بنەمای پێوانەکردن (واتە پێوانەکردن لەسەر مەی - قیاس علی الخمر) پێیان وایە کە مادده هۆشبەرەکان بە هەموو چەشن و پێکهاتەکانەوە حەرامێکی ئاشکرایە.

---

3. القرغولي (ثامر عبدالهادي): المخدرات ـ بغداد (سالی ؟)، ل 2.

4. أبو الروس (أحمد): مشكلة المخدرات و الادمان ـ المكتب الجامعي الحديث الاسكندريه 2003 ل11.

زۆر لە کتێبەکانی ((فقه)) چارەسەری ئەم بابەتەیان کردووە و بە تێروتەسەلی باسیان لە ئەحکامی مەی و ڕووەکەکانی ماددە هۆشبەرەکان کردووە. وەکو: ((کتاب الاشربة))[5]، ((کتاب الطعام و الشراب))[6]، ((کتاب حد السکر))[7].

ئەم فەتوا و پێوانەیەش لەسەر بنەمای چەند ئایەتی قورئانە وەکو: (النحل/ 67)، (البقرة/ 218)، (النساء/ 42)، (المائدة/ 90). هەروەها چەندین فەرموودەی پێغەمبەر (د.خ) وەکو:

- ((ما أسکر کثیره، فقلیله حرام))[8]، واتە: ((هەر شتێك کە زۆرەکەی سەرخۆش بکات، ئەوا کەمەکەشی حرامە!)).
- ((کل مسکر خمر، و کل خمر حرام))[9]، واتە: ((هەموو سەرخۆشکەرێك مەی دەژمێردرێت و هەموو مەیەکیش حەرامە!)).
- ((کل مسکر حرام))[10]، واتە: ((هەر شتێك کە سەرخۆش بکات، حەرامە!)).
- یاخود فەرموودەی بەناوبانگی: ((لا ضرر و لا ضرار فی الاسلام))، واتە: ((لە ئیسلامدا نە زیان هەیە و نە زیان گەیاندن بە خود و خەڵك هەیە!)).

بە پێی بڕیاری زانایانی ئیسلامی: ((کل ما یغیب العقل فانه حرام))[11]، واتە: ((هەر شتێك کە ئەقڵ و هۆشی مرۆڤ ببات، حەرامە)).

---

5. بڕوانە: ((صحیح مسلم))، چاپی صبیح، بەشی6، ل58 - هەروەها شەرحی موطأ امام مالك، زرقانی، بەشی 4، ل23.
6. بڕوانە: ((کتاب الام))، امام شافعی، چاپی امیریە ( 1321 هـ )، بەشی2، ل 213 - هەروەها بدایة المجتهد و نهایة المقتصد، ابن رشد قرطبی، چاپی صبیح، بەشی 1، ل 372 .
7. ((الفتاوی الکبری))، ابن تیمیة، دار الکتب الحدیثة، بەشی 4، ل 300 - هەروەها حاشیة الدسوقی علی الشرح الکبیر، للدردیر، بەشی4، ل 352 .
8. بڕوانە: ((التاج للأصول فی أحادیث الرسول))، شیخ منصور علی ناصف، چاپی دووەم، بەشی3، ل129.
9. بڕوانە: ((تفسیری رازی))، المطبعة العادیة (1308)، بەشی2، ل229.
10. ((سنن ابن ماجه))، تحقیق محمد فؤاد عبدالباقی، دار احیاء الکتب العربیة (1373 هـ)، بەشی 2، ل1223.
11. ابن تیمیة، سەرچاوەی پێشوو، بەشی 4، ل310.

بەم پێیە زۆر لە زانایان جۆری ئەو مەوادەشیان دیار کردووە کە کاری نێگـەتیڤی دەکەنە سەر لایەنی ((ئەقڵی و هەستی)) مرۆیی، وەکو: ((حطـاب)) کە زانایـەکی مالکیە و دەڵێت:

هەموو ئەو شتانە کـە ئـەقڵ و هۆشـی مرۆڤـ دەبـات، بـەڵام حواسـی نابـات، حەرامە! وەکو: مەی و (نبیذ) شەراب.

هەموو ئەو شتانە کە حواسی مرۆڤـ دەبات و ئـەقڵ و هوشـی نابـات، حەرامـە! وەکو: ئەفیون (تریاك و خەشخاش) و جەوزا (جۆرێك لە مـاددە هۆشـبەرەکانە) و بنج (جۆرێك لە حەشیشە) و... [12]

((ابن تیمیة)) دەڵێت: ((حەشیش و هەموو ئەو ماددانـەی کـە وەکـو حەشیـشن، حرامە جا سەرخۆش بکات یان نەکات و هەر کەس بە حەلالی بزانێ، کافرە!)) [13].

لەم دواییەدا، فەتوای ((دار الافتاء المصریة)) سـەبارەت بـە مـاددە هۆشـبەرەکان دەرکراوە، گوزارشت لە حەرامکردنی هەموو جۆرە ماددەی هۆشبەر دەکات، هەم بەکارهێنانی، هەم بازرگانی کردنی، هەمیش چاندن و بەرهەمهێنانی [14].

## ⋆ ماددە هۆشبەرەکان بـە پێـی بۆچونی لێژنـەی مـاددە هۆشـبەرەکان لـە نەتەوە یەکگرتووەکان:

لێژنەی ماددە هۆشبەرەکان سەر بە نەتەوەیەکگرتووەکان بـەم شـێوەیە پێناسـەی ماددە هۆشبەرەکان دەکات: ((ماددە هۆشبەرەکان بریتیە لە هەموو ئەو مەوادەی خاو یان دروستکراو کە خەیاڵ ساز ((منبهـة)) یاخود خەوهێنەر ((مـسکنـە))یـان

---

12. شرح الحطاب علی مختصر خلیل، بەشی3، ل232.
13. ابن تیمیة، سەرچاوەی پێشوو، ل310.
14. عیاد (سمیر): المخدرات سلاح الاستعمار و الرجعیة - دارالکتب العربی للطباعة و النشر1967، ل123- 129.

هەیە کاتێك کە بە کـار دێـت، نـەك بـۆ مەبەسـتی پزیـشکی یـان پیـشەسازی دیاریکراو، کە دەبێتە حاڵەتی گەڕانـەوە و دووبارەکردنـەوە و خووپێـوەگرتن بـە شێوەیەکی بەردەوام یان کاتی کە زیان دەگەیەنێتە تاك و کومەڵگا، هەم لە رووی جەستەیی و هەمیش دەروونی و کۆمەڵایەتیەوە))[15].

ئێمە لەم لێکۆڵینەوەدا، بۆ چـەمکی مـاددە هۆشـبەرەکان، وەکـو پێناسـەیەکی ئیجرائی پشت بەم پێناسەی دوایی دەبەستین.

**ماددە هۆشبەرەکان بۆ سێ جۆری سەرەکی دابەش دەکرێن:**

1- **پێکهاتەکانی خەشخاش:** کە تریاك، کودئین، هیرۆئین، مۆرفین و... دەگرێتەوە.

2- **ماددە خەیاڵسازەکان:** کـە کۆکـائین، L.S.D، حەشـیش و مـاری جوانـا دەگرێتەوە.

3- **ماددە خەوهێنەر و دژە دڵەڕاوکێیەکان:** کە باربیۆراتەکان و هەموو مەشروباتی ئەلکۆلی دەگرێتەوە[16].

هەموو ئەم مەوادە دەبنە هۆی بەسـتراوەیی جەستەیی و دەروونـی کـە لێـرە بـە کورتی جیاوازی ئەو سێ جۆرە باس دەکەین:

لە کوردستان بە حوکمی ئەوەی دراوسێ ئێرانە، هەر سێ جۆرەکانی بە کار دێت. (ئەو خووگرانەی کە بینیومانە زۆربەیان تریاك بەکار دەهێنن، بەڵام تووش بـووی بە هیرۆئین و حەشیشی تێدا بوو).

پێکهاتەکانی تریاك زۆرتر بۆ هێورکردنەوەی ئـازار کـەڵك وەردەگیرێـت و زیـاتر کاریگەری بەسەر دەمارەکان (بەتایبەتی دەماری هەستی) هەیە و لەلایەك دەبێتە هۆی نەمانی پالەپەستۆ و رەقبوونی دەمارەکـان و ماسـولکەیی و لەلایـەکی تـر

15. القرغولي، سەرچاوەی پێشوو، ل2.
16. أحمدی (د. سید أحمد): روانشناسي نوجوانان و جوانان - انتشارات مشعل، اصفهان 1383، ل189.

کەسەکە لە ژێر قورسایی هەستە بە نازارەکان رزگار دەکات، هاوکات لەگەڵ ئەو گۆڕانکارییانە، ناوەندە دەمارەکان دەجولێنێ و هەستێکی خۆشی بۆ دروست دەبێت، بە شێوەیەك کە کەسەکە لە کاتێ نەشەبووندا * گەشبینیەکی بێ هۆ و لە رادەبەدەری هەیە کە هەر کارێکی سەخت ئاسان دەبینێ و تەنانەت هەرکارێکی ناموومکین بە مومکین دەبینێت. هەر ئەوەشە دەبێتە هۆی دووبارە بەکارهێنانەوەی مادەکە[17]!.

مادە خەیاڵسازەکان زۆرتر کاریگەرییان لەسەر ناوەندی ژیری و دەماری ناوەندی هەیە و لە رێگای دروستکردنی خەیاڵاتی فراوان و بێ بنچینە، حاڵەتێکی رەوانی خۆش و ناراست دروست دەکەن. لە سەدەی دواییدا مادە خەیاڵسازەکان لەلایەن لاوانەوە بەکار هاتوە و رێژەی بەکارهێنانی رۆژ بە رۆژ لە بەرز بوونەوە دایە[18]. بۆ نموونە حەبی ((L.S.D)) کە مادەیەکی هۆشبەری دەستکردە واتە ((ئەسید لیزرێك دی ئیتل ئامید))، سەرەتا وەکو دەرمان بەکار دەهات و لە دواییدا ملیۆنان لاوی لە چینی ناوەندی کۆمەڵ تووش کرد.. ((ماری جوانا)) مەعجونێکە لە لق و گەڵای گیای شادانە.. ((حەشیش)) لە شیرەی گیای شادانەیە کە چەند بەرامبەر لە ماری جوانا بەهێزترە[19].

لە ماوەیەکی زۆر بەر لە ئێستا دەروێشەکان کەڵکیان لە ((بەنگ)) (بنج) کە جۆرێك لە حەشیشە وەردەگرت و لە ناو جیهانی خەیاڵ و ماخولیادا نوقم دەبوون! جیهانی واقعی بۆ مرۆڤەکان سەختە، وەکو ئەوە وایە کە حەزێك لە مرۆڤ دایە کە لە ئەقڵی خۆی رادەکات و پەنا بۆ جیهانی خەیاڵ دەبات[20].

---

* ئەو بارەیە کە تریاك کێش لە باری ئاگایی دەوروبەر بۆ باری نائاگایی دەگوازرێتەوە.

17. أردوباى (على): جوانان و مواد توهم زا - آواى نور، تهران 1382، ل3 .

18. سەرچاوەی پێشوو، ل9.

19. گورين (كوزه): تشخيص بيماريهاى روانى، ترجمەى پورأفكارى - انتشارات گنجينه1379، ل98.

20. أحمدی، سەرچاوەی پێشوو، ل190.

((ئەلکۆل)) وەکو دەرمانی دژی خەمۆکی (دژە دامرکان و دلّساردی) کار دەکات و هەروەها وەکو دەرمانە خەوهێنەرەکان دەبێتە هۆی ناکۆکی لە شوێن دۆزینەوە و گێژی، بێهێزی زمین، کەمکردنەوەی هێزی دادوەری و نەبوونی کەسایەتییەکی نەگۆڕ. زۆر کەس پێیان وایە کە ئەلکۆل دەبێتە هۆی جموجۆلّ و جوولّەی مرۆڤ، بەلاّم لە راستیدا وا نییە بە لکو دەبێتە هۆی سستی مرۆڤ. سەرەتا ئەلکۆل لە سەر ((کرتێکسی)) مێشك کاریگەری دەبێت و کۆت و بەندە ئەخلاقییەکان لا دەبات و حالّەتێکی خۆش دروست دەکات و وردە وردە لەگەلّ زۆری ژەهراوی بوون، رەفتار و قسەکان لەدەست کەسەکە دەچنە دەر. توێژینەوەکان نیشانی دەدەن کە کەسی ئەلکۆلی بەرپرسیارییەتی ژیانی رۆژانەی بۆ قبولّ ناکرێت[21].

## 2- چەمکی خووپێوەگرتن

زانایان - هەر یەك بە پشت بەستن بە بواری پسپوری خۆی - پێناسەی جۆراوجۆریان بۆ چەمکی ((خووپێوەگرتن)) یاخود ((ئیدمان)) (خووپێوەگرتن/ Addiction) کردووە، بۆ نموونە:

- **خووپێوەگرتن لە دەروونناسیدا:** چەمکی خووپێوەگرتن لە لای دەروونناسان بریتییە لە: خووگرتن و وابەستەیی بە شتێك کە ئاسەواری بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

- خووپێوەگرتن، پێویستی بە بەکارهێنانی ماددەیەکی هۆشبەرە کە ئەگەر بیەوێ بەکاری نەهێنێ و هێلاینی بکات، ئەوا هەندێ حالاّتی تایبەت بۆدروست دەبێ کە ناتوانێ بەرگەی بگرێت.

- زیادکردنی رێژەی ماددەی بەکارهێنراو لە پێناو دروستکردنی هەمان حالّەتی یەکەم، کە یەکەم جار بە کاری هێنا بوو.

---

21. عظیمی (د.محمد): مباحث اساسي روانشناسي - انتشارات كيهان، تهران 1380، ل 303.

- بەسترانەوە و وابەستەیی جەستەیی و دەروونی بەو ماددەیە کە دەبێتە هۆی هەوڵ دانی بەردەوام بۆ بەدەست هێنانی ئەو مادەیە[22].

★ **خووپێوەگرتن لە پزیشکیدا:** پزیشکەکان لە جیاتی زاراوەی ((خووپێوەگرتن)) زیاتر ووشەی ((وابەستەیی و بەسترانەوە بە ماددە هۆشبەرەکان)) ( Drug dependence) بە کار دەهێنن[23]. ((وابەستەیی جەستەیی)) بریتیە لە خوو پێوەگرتنی بەردەوام بە شێوەیەك ئەگەر بێتو بیەوێ هێلاینی بکات ناتوانێت و تووشی سڕبوونەوە و ئێش و ئازارێکی جەستەیی زۆر دەبێت[24].

★ **پێناسەی رێکخراوی تەندروستی جیهانی:** رێکخراوی تەندروستی جیهانی سەر بە نەتەوە یەکگرتووەکان، بەم شێوەیە پێناسەی ((خووپێوەگرتن)) دەکات: ((خووپێوەگرتن بریتییە لە حەز یان بەسترانەوە بە شێوەیەکی نائسروشتی و بەردەوام کە کەسانێك سەبارەت بەهەندێك لە مادە دەیانبێت))[25].

کەواتە مەبەست لە خووپێوەگرتن بەکارهێنانی ناپزیشکیانە و بەردەوامی ئەو دەرمانەیە کە بە زیانی بەکارهێنەرەکە و خەڵکانی تر تەواو دەبێت[26].

★ **پێناسەی ئیجرائی بۆ خووپێوەگرتن:** لە ئەنجامی ئەم پێناسانەی سەرەوە دەتوانین پێناسەی خووپێوەگرتن بکەین، بەم شێوەیە: ((خووپێوەگرتن بریتیە لە دیاردەیەکی دەروونی - کۆمەڵایەتی کە تاکی بەکارهێنەر بە هۆی کۆمەڵێك

---

22. کریم پور (صادق): روانشناسی اعتیاد - تهران 1365، ل36.
23. العیسوی (د. عبدالرحمن محمد): المخدرات و أخطارها - دارالفكر الجامعي، الاسكندرية 2005، ل21.
24. فدایی (فرید) و سجادیه (د. سید محمد علی): شناخت و پیشگیری و درمان اعتیاد - نشر تابان، تهران 1365، ل9.
25. أحمدی، سەرچاوەی پێشوو، ل187.
26. گورین، سەرچاوەی پێشوو، ل6.

پاڵنەری دەروونی و جەستەیی و ژینگەیی بە شێوەیەکی درێژخایەن تووشی دەبێت و دەبێتە هۆی زیانگەیاندن بە خۆی و کۆمەڵگا، هەروەها بەرز بوونەوی رێژەی تاوان و کێشەی جۆراوجۆری دەروونی و کۆمەڵایەتی)).

**بەم پێیە خووپێوەگرتن دەبێ چوار تایبەتمەندی خوارەوەی هەبێت:**

1. **مەیل و رووکردن لە زۆر بەکارهێنانی مادەکە**: ئەم تایبەتمەندییە بە ((خۆراگری دەرمانی)) ناوزەد کراوە (ظاهرة الاحتمالية/ Tolerance)، لەو حاڵەتەدا تاکی خووگر جۆرێك گونجانی لەگەڵ مادەکە بۆ دروست دەبێت و بۆ دروستکردنی هەڵسوکەوت و پەرچەکرداری هاوشێوە دەبێ رێژەی مادەکە رۆژ بە رۆژ زیاتر بکات[27].
2. **وابەستەیی و بەستراوەیی جەستەیی و دەروونی**: بەستراوەیی جەستەیی حاڵەتێکی فیزیۆلۆژییە (Physiological addiction) کە بە هۆی بەکارهێنانی بەردەوامی مادەکە دروست دەبێت و دەبێتە هۆی دووبارەکردنەوەی بەکارهێنان[28] و، بەکارنەهێنانی دەبێتە هۆی دەرکەوتنی هەندێك دەرەنجام کە پێی دەوترێت: ((سەندرۆمی نەگەیشتن)) (أعراض انسحاب/ Withdrawal syndrome). بۆنموونە: لە دوای بەکارنەهێنانی تریاك نیشانەکانی پێنەگەیشتن زۆر جار دوای 8 تا 13 کاتژمێر دەردەکەون کە بریتییە لە هاتنی ناو لە لوت و چاو، باوێشك، عارەقەکردن و لەو کاتەدا خەو بەسەر ئەو کەسەدا دێت و دوای هەڵسان لە خەو زۆر نائارام و پەشۆکاو دەبێت. نیشانەکانی تری پێنەگەیشتن دوای 24 تا 48 کاتژمێر دەردەکەون کە ئەوانیش بریتین لە گەورەبوونی گلێنەی (رەشکۆکەی) چاو، هەست کردن بە سەرما، هەستانەوەی تووکی جەستە، رشانەوە، بێ ئیشتیایی، سکچوون، سك ئێشە، بێخەوی و بێهۆشی[29].

---

27. العیسوی، سەرچاوە پێشوو، ل21.

28. أحمدی، سەرچاوەی پێشوو، ل187.

29 . کورین، سەرچاوەی پێشوو، ل102.

((بەستراوەیی دەروونی)) جۆرە رەفتارێکی تایبەتە لە بەکارهێنانی زۆرەملێی ماددەکە کە وا لە تاکەکە دەکات بەردەوام بێت لە هەوڵدان بۆ بەدەست هێنان و بەکارهێنانی ئەو ماددەیە، هەروەها مەیل و حەزێکی بەهێز لە لای دروست دەکات کە ناتوانێ هێلاینی بکات، بۆیە بەردەوام بۆ لای ئەم ماددەیە دەگەڕێتەوە[30]. کاتێك کە کەسەکە گەیشتە ئەو ئاستە چی تر چێژ لەو مادەیە وەرناگرێت، بەڵکو بەکارهێنانی دواتر تەنها لە رووی ناچاری دەبێت!

3. **حەز و پێویستییەکی بەهێز**: ئەم حەز و مەیلە بۆ مادەکە( Craving for drug) تارادەیەکە کە بەهەر شێوەیەك بێت هەوڵدەدات ئەو مادەیە بەدەست بهێنێ! پێویستی بەردەوام بەپارە بۆ دابین کردنی مادەکە تاکی خووگر تووشی کاری نارەوا دەکات! توێژینەوەی گروپی پزیشکی ((جان هاپکینز)) لەساڵی 1971 پیشان دەدات کە 12000 خووگری شاری ((بالتیمور)) ساڵانە بایی 300 ملیۆن دۆلار کەل و پەلی جۆراوجۆریان لە دوکانەکان دزیوە و دوای فرۆشتن بە یەك لەسەر سێی نرخی خۆی، سەرفی کڕینی مادەکەیان کردووە![31].
4. **زیانی بۆ تاك و کۆمەڵگا**: مادە هۆشبەرەکان لە هەموو روویەکەوە زیانی مادی و مەعنەوی هەیە بۆ کەسەکە و بۆ کۆمەڵگا بەگشتی[32]، واتە لە رووی دەروونی، کۆمەڵایەتی، ئابووری، فەرهەنگی و... راپۆرتی سیمیناری بەرەنگاربونەوەی مادە هۆشبەرەکان لە ساڵی 1985 لە ئێران پیشان دەدات: ئەگەر رۆژانە هەر خووگرێك 100 تومان خەرجی مادە سڕکەرە بکات ئەوا رۆژانە 100 ملیۆن تومان زیانی ماددی بە کۆمەڵگا دەگات. ئەگەر هەر خووگرێك 5 کەس لە بنەماڵەدا هەبێ ئەوا تەندروستی دەروونی 5 ملیۆن کەس دەکەوێتە مەترسییەوە![33].

---

30. أردوبای (علی): اعتیاد بلای قرن بیستم - نشر گنجینه، تهران 1378، ل17.
31. أردوبای، سەرچاوەی پێشوو، ل17.
32. بڕوانە: شعبان (د. صباح کرم): جرائم المخدرات ـ المنصور، بغداد1984، ل35 و36.
33. احمدی، سەرچاوەی پێشوو، ل188.

## 3- چەمکی خووگر

((خووگر)) یاخود (مودمن/ خووگرتوو) ئەو کەسەیە کە لە رووی دەروونی و جەستەییەوە وابەستە بە یەکێك لە مەوادی هۆشبەر دەبێت[34].

رێکخراوی تەندروستی جیهانی سەر بە نەتەوە یەکگرتووەکان، بەم شێوەیە پێناسەی ((خووگر)) دەکات، کە ئێمەش وەکو پێناسەی ئیجرائی خۆمان پشتی پێی دەبەستین: ((خووگر)) ئەو کەسەیە کە بە هۆی بەکارهێنانی مەوادێکی هۆشبەر یا خود دەرمانێکی کیمیایی بە شێوەیەکی بەردەوام تووشی خووپێوەگرتن و وابەستەبوون دەبێت[35]. هەروەها لەو پێناسەیە دا، بەکارهێنەرەکانی مادده هۆشبەرەکان (وەکو: توتن، مەشروباتی الکحولی، تریاك، حەشیش، هرونین و ال. اس. دی و...) بە تاکەکانی ناسروشتی و لادەر ناو دەبات[36].

★ پێوەرەکانی دەستنیشانکردنی خووگرتوو: لێرە باس لە هەندێ پێوەر دەکەین کە تاکی خوگرتوو لەگەڵ تاکی ساغ و سرۆشتی جیادەکاتەوە:

زۆر جار خودی خووگر داندەنێت کە خووگرتووە و پێویستی بە ماددەی هۆشبەر هەیە، بەڵام بە هۆی هەندێ گوڕانکاری دەروونی و کۆمەڵایەتی و رەفتاری تیایدا، دەتوانین بزانین کە ئەو تاکە خووگرتووە! بۆ نموونە:

1- خوگرتوو خاوەن لەشێکی لاواز و رەنگێکی زەرد و بەساڵاچوو و رەشی هەیە و ددانەکانی - بەردەوام- رزیو و زەردە.

2- بچوکبوونی گلێنە و رەشکۆکەی چاوەکان، نیشانەی خووپێوەگرتن، بەڵام نەك نیشانەیەکی یەکلاکەرەوە.

---

34 . فدایی و سجادیە، سەرچاوەی پێشوو، ل9.

35. دانش (تاج زمان): مجرم کیست، جرم شناسی چیست؟- انتشارات کیهان، تهران 1384، ل267.

36 . ستوده (د. هدایت الله): آسیب شناسی اجتماعی - انتشارات آوای نور، تهران 1384، ل188.

3- خوگرتوو کەسێکی بێ ئارام، هەڵچوو، توورەیە و فشار و دڵەراوکێی پێوە دیارە، کە بە شێوەیەکی لەناکاو دەگۆڕێت بە سەرخۆشی و هێمنی و ئارامیەکی ئاشکرا.

4- حەز بە گۆشەگیری و دوور بوونەوە لە خزمان بە تایبەتی لە دایك و باوك، برا و خوشك، و بە پێچەوانەوە حەز لە نزیکبوونەوە و تێکەڵ بوون لەگەڵ برادەری نوێ و گوماناوی و نەناس دەکات.

5- گۆڕانی کاتی خەوتن، درەنگ خەوتن لە شەو و درەنگ هەستان لە بەیانیان.

6- بەرزبوونەوەی خەرجی رۆژانە و داواکردنی پارە بە شێوەیەکی بەردەوام لە دایك و باوك و خەڵکانی تر.

7- داخستنی دەرگا لە سەر خۆی بۆ ماوەیەی درێژ بۆ ئەوەی گۆڕانکاری لە حاڵەتەکەی بشارێتەوە لە خەڵك.

8- گرنگی نەدان بە رەواڵەت و جوانی و خاوێنی خۆی، هەبوونی پرچی تێکەل و پێکەڵ، جل و بەرگی پیس و...

9- زۆر بوونی هاتوو و چووی گوماناوی و بێ ئامانج و بێ مانا.

10- زۆر خەوتن، خەموکی لەگەڵ شادمانی و خۆشییەکی زۆر کاتی.

11- مانەوەی لە رادەبەدەر لە توالێت.

12- زۆر قسەکردن، درۆکردن، وادەی زۆری بێ بنەما.

13- بەکار هێنانی دەرمانی دەمارەکان یان خەوهێنەر، یان پەیدابوونی هەندێ ئامرازی نوێ و گوماناوی بۆ بەکارهێنانی مەوادی هۆشبەر لە ژینگەی خووگرتوودا.

14- گرنگی نەدان و فەرامۆشکردنی پیشەو کار و خۆدزینەوە لە ئەرکەکان بە تایبەتی کاری جەستەیی وەکو وەرزش کردن![37].

15- گرنگی نەدان بە یاساکانی کۆمەڵگا.

16- زۆر بوونی ڕێژەی تاوانەکان، بە تایبەتی دزی کردن لە پێناو کڕینی ماددەی هۆشبەر.

17- هەبوونی ژیانێکی نائەخلاقی و کەسایەتیەکی خۆپەرستانە، نەبوونی بەرپرسیارێتی و چاوەڕوانی زۆر لە خەڵك، بەتایبەتی لە دەوروبەری خۆی.

18- بەکارهێنانی بەرهەڵستکاری و گازاندە و ڕەخنەی بەردەوام لە خەڵك وەکو میکانیزمێکی بەرگری بە شێوەیەك کە تاکەکانی کۆمەڵگا بە تاوانبار و بەرپرسیاری نەهامەتیەکەی خۆیان دەزانن[38].

---

37. ستودە، سەرچاوەی پێشوو، ل190 و 191.

38. فرجاد (د. محمد حسین): آسیب شناسی کجرويهای اجتماعی - انتشارات قوەی قضائیە، تهران 1383، ل147.

# بەشی سێیەم: هوکارەکانی خووپێوەگرتن بە ماددە هۆشبەرەکان

## أ. هۆکارە خودییەکان:

1- هۆکارە جەستەیی و بایۆلۆژییەکان

2- هۆکارە دەروونییەکان

## ب. هۆکارە بابەتییەکان:

1- هۆکاری خێزانی

2- هۆکارە کۆمەڵایەتییەکان

3- هۆکارە ئابوورییەکان

4- هۆکارە سیاسییەکان

5- هۆکارە جوگرافییەکان

6- هۆکارە یاساییەکان

# بەشی سێیەم: هۆکارەکانی خووپێوەگرتن بە ماددە هۆشبەرەکان

### أ- هۆکارە خودییەکان

هیچ کاتێك یەك هۆکـار بـە تـەنهایی نابێتـە هـۆی خووپێـوەگرتن بـە مـەوادی هۆشبەر، بەڵکو چەندین هۆکار پێکـەوە دەسـتیان هەیـە لـە سـەرهەڵدانی ئـەم دیاردەیە، یاخود زەمینەی گونجاو دەرەخسێنن بۆ تووش بوونی تاکەکان.

رێکخراوی تەندروستی جیهانی ئاماژە بە سێ هۆکاری سەرەکی کردووە: ((دەرمانی و فارماکۆلۆژیکی))* و ((تاکەکەس و کەسایەتی)) و ((کۆمەڵایەتی))[39]. بەڵام دەکرێ بە شێوەیەکی ووردتر- بە پشت بەستن بـەو سەرچـاوە جۆراوجۆرانـە کـە هەمانـە - هۆیەکانی خووپێوەگرتن بە ماددە هۆشبەرەکان بە دوو هۆکاری سەرەکی ((خودی)) و ((بابەتی)) دابەش بکەین کە لێرە دا باس لە هۆکارەخودییەکان دەکەین کە دەتـوانین بەم خاڵانەی خوارەوە کورتیان بکەینەوە:

### 1- هۆکارە جەستەیی و بایۆلۆژییەکان

لێرەدا باس لە کاریگەری بۆماوەیی (الوراثة) و جینەکان و نەژاد (عرق) و رەگـەز و تەمەن و حاڵەتی جەستەیی دەکەین:

- **هۆکاری بۆماوەیی و جینـەکان:** خووپێوەگرتنی دایـك و بـاوك، کاریگـەری راستەوخۆ هەیە لە سەر منداڵەکان. ئەو ژەهـرەی کـە لـە ئـەنجامی مـەوادی هۆشبەر لە جەستەی دایك و باوك دروسـت بـووە، دەگوازرێتـەوە بـۆ جـنین و دەبێتە هۆی خووگر بوونی جنین بەو ماددەیەی کە دایکەکەی پێـی خووگرتـوو

---

* فارماکۆلۆژیکی: زانستی دەرمانسازی.

39 . أحمدی، سەرچاوەی پێشوو، ل196.

بووه[40]. هەندێ لە زانایان وەکو ((گرا)) پێیان وایە کە هەندێ کەس لە ناو مێشکیان دا ماددەیەکی کیمیاوی بە ناوی ((ئانـدرۆفین)) و ((سـرۆتۆنین)) و ((دۆپامین)) نیە، کە ئەم جۆرە کەسانە زیاتر پەنا دەبنە ماددە هۆشبەرەکان کە وەکو جێگرەوە دەژمێردرێت بۆ ئەم مەوادانە[41].

- **هۆکاری نـەژادی:** مەیل بۆ خووپێوەگرتن لە نەژادە جۆراوجۆرەکـان جیـاوازە. بۆ نموونە زەرد پێستەکان و سپی پێستەکان زیاتر لە رەش پێـستەکان تووشـی ماددە هۆشبەرەکان دەبن[42].

- **هۆکاری رەگـەزی:** بە پێی ئامارەکان و لێکۆڵینەوەکان، ژنان کەمتر لە پیاوان تووشی ماددە هۆشبەرەکان دەبن. بەڵام ئاسـەواری نێگـەتیڤی خووپێـوەگرتنی ژنان بەهێزترە لە خووپێوەگرتنی پیاوان[43].

- **هۆکاری تـەمـەن:** لە هەر ئاستێکی تەمەنی دا، ئەگەری خووپێـوەگرتن زۆرە. لەو خێزانانەی کە دایك یان باوك، یاخود هەردووکیان خووگر بن، ئەوا منداڵی کەم تەمەنیشیان تووشی هەمان ماددە دەبن و دواتر لەگـەڵ گـەورە بوونیـان، جۆری ماددەکـە دەگـۆڕن. بـە پێـی ئامـاری رێخـراوی تەندروسـتی جیهـانی (72٪)ی خووگرەکان لە سەرتاسەری دونیا دا لە ژێر تەمـەنی (25) سـاڵ دان! خووگرەکان -بەشی زۆریان -بە جگەرە کێشان دەست پێدەکەن و دواتـر وردە و وردە بەرەو ماددە هۆشبەرەکان دەچن[44].

---

40. ساعی (بهروز): بررسی علل گرایش معتادان به مواد مخدر، پایان نامەی کارشناسی أرشد، دانشکدەی علوم اجتماعی و تعاون، تهران1370، ل 112.
41. آزمون (علی): سبب شناسی اعتیاد - مجلەی اجتماع درمان مدار، سال دوم، ژمارەی 3، بهار 1384، ل4 و 5.
42. تاج زمان دانش، سەرچاوە پێشوو، ل276.
43. صفری (فاطمە): اعتیاد و زنان، تفاوتهای جنسیتی در زمینەی سوء مصرف مواد و درمان آن - ستاد مبارزه با مواد مخدر، تهران1381، ل1 و2.
44. تاج زمان دانش، سەرچاوەی پێشوو، ل276.

- **باری جەستەیی:** بەکارهێنانی دەرمانە نازاربەر و خەوهێنەرەکان بۆ هەندێ لە نەخۆشی و ئێش و نازاری جەستەیی و ماندووبوون، ئەو تاکانەی زیاتر بەروە خووپێوەگرتن دەبات. بە تایبەتی ئەوانەی پیشەی گرانیان هەیە و زۆر ماندوو دەبن و خەویان کەمە. یا خود زێدەڕۆیی کردن لە پەیوەندی سێکسی دەبێتە هۆی کەم بوونی هێز و لاواز بوونی توانای دەروونی تاکەکان، کە هەموو ئەوانە زیاتر لە مەترسی تووش بون بە ماددە هۆشبەرەکان دان[45].

مادە هۆشبەرەکان بەتایبەتی پێکهاتەکانی تریاك لەوانەیە بۆ هێورکردنەوەی هەندێ نازار وەکو: نازاری گەدە، قاچ، ڕۆماتیزم*... لەلایەن پزیشکەوە بدرێت، ئەو هێورکردنەوە کاتییە و کەسەکە بۆ دووبارە بەکارهێنان و لە ئەنجامیشدا بۆ خووگرتن ڕادەکێشێت[46].

## 2- هۆکارە دەروونییەکان

- ئەو تاکانەی کە بەدەست هەندێ نەخۆشی دەروونی وەکو ((نوروتیك)) و ((سایکۆپاتیك)) و ((هیپو کندریا)) و ((خەموکی)) دەناڵێنن، لە پێناو نەهێشتنی فشار و دڵەراوکێ و کێشەی دەروونی، زیاتر لە مەترسی تووش بوون بە ماددە هۆشبەرەکان دان[47].
- ئەوانەی کە کێشەی ((کەسایەتی))یان هەیە، بە تایبەتی ((ئیرادەی لاواز)) و ((شپرزە و کێشەی زەینی))، ((باوەڕ بە خۆنەبوون))، ((نەگونجان و هەڵاتن لە واقع و کێشەکانی ژیان))، ((تەنهایی و گوشەگیری))، ((دەمارگیری و ئائارام)) و...هتد [48].

---

45 . تاج زمان دانش، سەرچاوەی پێشوو، ل277.

* ڕۆماتیسم: نەخۆشییەکی جەستەییە کە تووشی خوێن و جومگەکانی لەش دەبێت.

46 . أحمدی، سەرچاوەی پێشوو، ل196.

47 . سەرچاوەی پێشوو، ل196 تا 198.

48. تقی زادە(داریوش): اعتیاد، علل، پیشگیری و درمان - مجلەی اجتماع درمان مدار، سال دوم، شمارە 3، بهار1384، ل8 و9.

- هەندێ کەس لە هەست کردن بە گوناه، لە خۆیان بێزار دەبن و پەنا بۆ ماددە هۆشبەرەکان دەبەن[49] .
- هەندێ کەس بۆ تێرکردنی ئارەزوو دەروونییەکانی وەکو: ((ئارەزووی سێکسی)) و ((لەزەت و خۆشی)) و ((سەربەخۆیی و ئازادی)) و... خووگر دەبن.
- سەڵت و رەبەنەکان زیاتر تووش دەبن.
- تێرکردنی (فزولی- Curiosity) و حەزی مەعریفی و هەڵسەنگاندنی هێزی جەستەیی خۆی[50] .
- هەرەسهێنان بە هۆی سەرنەکەوتن لە قۆناغەکانی ژیان (هاوسەرگیری، بە دەستهێنانی پارە، خوێندن، خۆشەویستی و...هتد).
- هاوسەرگیری زۆرەملێ.
- دووری لە خێزان یاخود لە دەستدانی کەس و کاری نزیك.
- لە کاتی خزمەتی سەربازی[51] .
- تێڕوانین و ئاراستەی پۆزەتیڤی بە ماددە هۆشبەرەکان، نەبوونی باوەڕ و پێوەری ئاینی و مەزهەبی، گرنگیدان بە بەها و پێوەرەکانی خۆی و رەچاو نەکردنی بەها و پێوەرە کۆمەڵایەتییەکان، نەبوونی هەستی بەرپرسیارێتی[52] .

### ب- هۆکارە بابەتییەکان

خووگرتن جۆرێکە لە نەخۆشی کۆمەڵایەتی. لەو سەردەمەدا کە بارودۆخی گونجاوی کۆمەڵایەتی بۆ ژیانێکی مرۆیی و پڕ لە خۆشەویستی لەبار نییە، بە

---

49. یزدانی (د. غلامرضا): «اعتیاد چیست؟» لە سایتی «اطلاع رسانی نیروی انتظامی جمهوری اسلامی ایران»: http://www.police.ir/druqs/avarez.htm

50. تاج زمان دانش، سەرچاوەی پێشوو، ل277.

51 . مولوی (فاطمە): نگاهی بە آسیب شناسی اعتیاد - سایتی ئینتەرنێتی: http:// www.dchq.ir/

52 . نارنجی ها (د. هومن): علل گرایش بە سوء مصرف مواد مخدر - سایتی ئینتەرنێتی: http:// www.dchq.ir

شێوەیەك دەبینین مرۆڤەکان لە یەکتر دوور بوونەتەوە و سۆزداری مرۆڤ کەم بۆتەوە و ئاسایش بەرقەرار نییە، نائارامی، زۆربوونی حەز بۆ تۆڵەنەستاندنەوە و دڵەڕاوکێ، لەو بارودۆخەدایە کە مرۆڤ بۆ سارێژکردنەوەی نێشەکانیان روو لە مادە هۆشبەرەکان دەکەن. لەو جۆرە کۆمەڵگایەدا ڕێژەی ماددە هۆشبەرەکان بەرز دەبێتەوە. ئەگەر سەیری هۆکارەکانی تووشبوون بە ماددە هۆشبەرەکان بکەین، دەبینین کە جگە لە هۆکارە خودییەکان، چەندین هۆکاری بابەتی هەن کە رۆڵی سەرەکی لە ماددە هۆشبەرەکان دەبینن:

**1- هۆکاری خێزانی**

خێزان گرنگترین دەزگای پەروەردەکردن و بەکۆمەڵایەتی کردنی تاکەکانە.. بۆیە جۆری پەیوندی و جۆری رەفتار لە ناو خێزاندا، دەوری سەرەکی لە راکێشانی تاکەکان بۆ ماددە هۆشبەرەکان دەبینێت:

- خووپێوەگرتنی دایك و باوك، یان یەکێك لە ئەندامانی خێزان.
- خێزانی ناارام و شپرزە[53].
- نەخوێندەواری و فەرامۆشکردنی دایك و باوك و نەبوونی کونترۆڵ و چاودێری لە سەر منداڵان، پەروەردەی نادروستی منداڵان[54].
- بوونی دوو چینی جیاواز: نەبوونی خۆشگوزەرانی ماددی و هەژاری ئابووری خێزان، هەروەها بوونی رفاهی ئابووری و داهاتی باشی خێزان[55].
- پەیوەندی لاواز لە نێوان ئەندامەکانی خێزان، بە تایبەتی لە نێوان دایك و باوك و منداڵان، یاخود لە نێوان ژن و پیاو.
- نەبوونی باوەڕ و پابەندبوونی ئایینی لە ناو خێزان (لاوازی ورە) و گرنگیدان بە شتە ماددییەکان.

---

53. أحمدی، سەرچاوەی پێشوو، ل200 و 201.
54. حسینی زاهدی (سید ولی): مقالەی «اعتیاد و جوانان» - سایتی پێشوو.
55. بڕوانە: فرجاد، سەرچاوەی پێشوو، ل155و 156.

## 2- هۆكاره كۆمەڵایەتییەكان

- هەبوونی مادده هۆشبەرەكان لە ناو كۆمەڵگا، بە شێوەیەك كە تاكان بە دەستیان بكەوێت بە بێ مۆڵەتی پزیشك.

- هەبوونی نابەرابەری و نایەكسانی، واتە بوونی بەربەست لە نێوان چینە كۆمەڵایەتیەكان. بۆ نموونە لە ئەمریكا بە هۆی جیاوازی چینایەتی، رێژەی مادده هۆشبەرەكان و خووگرەكان لە هەموو ولاتێك زیاترە.

- بێكاری، كە كێشەیەكی كۆمەڵایەتی بەهێزە و رێگا بۆ لادان بە تایبەتی بۆ مادده هۆشبەرەكان خۆش دەكات. چونكە بێكارەكان زیاتر كاتی خۆیان لە قاوەخانەكان و گەڕان لەگەڵ برادەری خراپ و... دەبەنە سەر.

- گەشەكردنی لە رادەبەدەری پیشەسازی و كاركردنی زۆری كرێكاران و ماندووبوونیان و...[56].

- نەبوونی هوشیاری كۆمەڵگا لە سەر مادده هۆشبەرەكان و ئاسەوارە نێگەتیڤەكانی.

- بێ بەندوباری ئەخلاقی و لاوازبوونی باوەڕی ئایینی و بنەماكانی.

- نەخوێندەواری یا خود رێژەی كەمی خوێندەواری، هەر وەك لێكۆڵینەوەی جۆراوجۆر پیشان دەدەن، ئەوانەی ئاستی خوێندەواری بەرزیان هەیە، كەمتر تووش دەبن.

- هەستان و دانیشتن لەگەڵ برادەری خووگرتوو.

- ئامرازی راگەیاندن كە بە شێوەیەكی تێرو تەسەلی مادده هۆشبەرەكان پیشان دەدەن كە هەستی فزوڵییەت لە ناو خەڵك دا دروست دەكات، بەتایبەتی لە لای منداڵان و گەنجەكان.

---

56. هەمان سەرچاوە، ل156 تا 157.

- کۆچ کردن بۆ شارەگەورەکان، کە جیاوازی فەرهەنگی و خەم و خەفەتی بێگانەیی و دوور کەوتن لە خزم و کەس، باری خراپی نیشتەجێ بوون و... ڕێگا خۆشکەرن بۆ مادده هۆشبەرەکان.

- نەبوونی خۆشگوزەرانی کۆمەڵایەتی و خزمەتگوزاری پێویست و گونجاو، شوێنەکانی رابواردن و سەرگەرمی و وەرزشیەکان بۆ پڕکردنەوەی کاتی دەستبەتاڵی خەڵك بە تایبەتی گەنجەکان.

- هەندێ لە تاکەکان، خووپێوەگرتن بە کار دەهێنن وەکو بەرەنگار بوونەوە بەرامبەر بە خێزان، پێوەرەکان، داب و نەریتەکان و... بەگشتی سەرکێشی خۆیان دژ بە کۆمەڵگا و خێزان بە خووگر بوون پیشان دەدەن[57].

- نەبوونی ووتاری ئایینی لە لایەن مامۆستایانی ئایینی و نەزانینی زانیاری پێویست سەبارەت بە حەرام بوونی مادده هۆشبەرەکان بە هەموو جۆرەکانەوە.

### 3- هۆکارە ئابوورییەکان

خووپێوەگرتن لە ناو هەموو توێژ و چینە کۆمەڵایەتییەکاندا هەیە:

- سەرمایەدارەکان بە هۆی هەبوونی ئیمکانیات و پارە و سامانی باش، لە پێناو لەزەت و خۆشگوزەرانی و چێژ وەرگرتن، بە تایبەتی لە کاتێ میوانداری بۆنەکان زیاتر بەرەو مادده هۆشبەرەکان دەچن.
- هەژار و بێکارەکان، کە زۆر جار قاچاغچییەکانی مادده هۆشبەرەکان بۆ بەکارهێنانیان لە دابەشکردن و کڕین و فرۆشتنی مادده هۆشبەرەکان، تووشی خووپێوەگرتن دەکەن[58] و، دەبنە قوربانی ئامانجەکانیان.

57. بڕوانە: فرجاد، سەرچاوەی پێشوو، ل278 و 279.
58. تاج زمان دانش، سەرچاوەی پێشوو، ل279.

- قەیرانی ئابووری، کە زۆر جار لە دوای شەڕەکان دروست دەبێت و دەبێتە هۆی هەژاری خەڵك و ئەوەش خۆی لە خۆی دا دەبێتە فاکتەرێکی یارمەتیدەر بۆ ماددە هۆشبەرەکان[59].

## 4- هۆکارە سیاسییەکان

هۆکاری سیاسیش نابێ لە فراوانبوون و بڵاوبوونەوەی دیاردەی ماددە هۆشبەرەکان، لە بیر بکەین:

- **داگیرکەران:** یەکێك لە هۆکاری ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆی بڵاوبوونەوە ماددە هۆشبەرەکان داگیرکەران بوون بۆ پاشکەوتن و وابەستە بوون و ڕازی بوون بە داگیرکەران و و دەرەنجامەکانی و بەرگری نەکردن و بیر لە سەربەخۆیی و ئازادی نەکردنەوە، کە داگیرکەران لە پشت ئەوەدا دەگاتە ئامانجەکانی کە بریتییە لە قۆرغکردنی سەرمایە و سامانی گەڵ و وولاتیان! بۆنموونە: بازرگانی تریاك لەلایەن بەریتانیا لە چین کاتێ داگیرکردنی چین بە ناوبانگە، کە بریتانیای داگیرکەر بە گوورزی ماددە هۆشبەرەکان، خەڵکی چالاك و بە جم و جۆڵی چینی کردە کەسانی پاشکۆ و ناقایم. دواتر بووە هۆی شەڕ لە نێوان خودی خەڵك لەلایەك و لە نێوان داگیرکەر و بازرگانەکانی تریاك کە لە لایەنگرانی داگیرکەر بوون لە لایەکی دیکەوە لە مێژووی ئەم وڵاتەدا بە ناوی جەنگی ئەفیون ((حرب الافیون)) ناسراوە[60]. ڕاپۆرتی ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی باس لەوە دەکات کە هەندێك ناوچە لە هیند، تایلەند، بەرازیل، پاکستان و ئەفغانستان، بۆ چاندن و بەرهەم هێنانی مادە هۆشبەرەکان تەرخان کراون و قاچاغچییەکانی مادە هۆشبەرەکان بە شێوەی جۆراوجۆر ئەو ماددەیە بۆ سەرتاسەری جیهان دەگوازنەوە و کە زۆر جار دەستی یەکێك لە پیاوانی دەسەڵات یان بەرپرسێکی دەوڵەتی تێکەڵاوی ئەو کارەیە.

---

59. فرجاد، سەرچاوەی پێشوو، ل159.

60. المغربی (د. سعد): ظاهرة تعاطی الحشیش - دار الراتب الجامعیة، بیروت 1984، ل19.

جێگای سەرسوڕمانە کە کەنارێکی گچکەی وەکو هۆنگ کۆنگ نزیکی دە هەزار شوێنی کێشانەی ماددە هۆشبەرەکانی هەیە، لەو کەنارە رۆژانە 35 کەس بە تاوانی قاچاغی مادە هۆشبەرەکان گیراون و لە سەدا هەفتای بەند کراون[61].

- **پشتگیری هەندێ وولات لە بەرهەمهێنان و بازرگانی کردنی ماددە هۆشبەرەکان:** وەکو ئەفغانستان، بە تایبەتی لە سەردەمی ((تالیبان))، بۆ نموونە لە سالانی 1997 و 1998 لە لوتکەی دەسەلاتی تالیبان، رێژەی بەرهەمی ماددە هۆشبەرەکان گەیشتە 4800 تەن کە داهاتەکەی نزیکەی 25 ملیارد دولار بوو[62].

- **دژایەتی نەتەوەیی:** بۆ نموونە لە ((ئێران)) دەبینین کە مادەی هۆشبەر لە هەموو شارەکانی دا تاوانکاریەکی گران و سزایەکی گرانیشی هەیە، بەلام لە ((کوردستانی ئێران))دا جۆرێك لە نەزانی و ئاسانکاری و تەغامز دەبینرێ و ئازادییەکی ئەوتۆ هەیە لە بەکارهێنان و کڕین و فرۆشتن و بازرگانی کردنی ئەم جۆرە مەوادە کە وای لێهاتووە گەنجەکانی کوردی ئێران کە لە یەکەمەکانی زانکۆکانی تاران بوون و روحی نەتەوایەتییان بەهێز بوو، ئێستا تووشی ئەو نەخۆشییە تێکدەر و لاوازکەرە بوونە و لە ژێر دیوارەکان و چوارڕێیەکانی سنە و مەهاباد و بۆکان و... بێکار دەسووڕێن و دەجولێن و بەدوای ئەم مەوادە دا وێلن. کاتێ کە سەردانی چەند خووگرتوومان کرد کە لە ئاسایشی هەولێر گیرا بوون، یەکێك لەوان ئاشکرای کرد کە ((اطلاعات))ی ئێران (دەزگایەکی ئەمنیە) رایسپاردم کە ((تریاك)) لە ئێرانەوە بۆ کوردستان بهێنم و مانگانە موچەیەکی دیاریکراوم بدەنێ!

---

61. أردوبای (علی): گسترش جهانی اعتیاد - انتشارات کیهان، تهران1379، ل125.
62. هاشمی (د. علی): سەرچاوەی پێشوو، ل11.

### 5- هۆكاره جوغرافییەكان

پێگـەی جوغرافیـایی لـە هەنـدێ وولاّتـدا كـونترۆلّ كـردن و چـاودێری كردنـی سنوورەكان زەحمەت دەكات و دەست گەیشتن بو ماددە هۆشـبەرەكان و بازرگـانی كردن و كڕین و فرۆشتنی ئاسان دەكات. كەمتەر خەمی دەوڵەتانیش ئەم هۆكارە بەهێزتر دەكات.. بۆ نموونە: بوونی ((ئێران)) لە تەنیشت ((ئەفغانستان)) و بوونی ((كوردستانیش)) لە تەنیـشت ((ئێـران)) یـەكێك لـە هۆكارەكـانی بلاّوبونـەوە و ئاڵوگۆڕكردنی ماددە هۆشبەرەكانە لە نێوان دوو سنوری (ئێران و ئەفغانـستان) و (ئێران و كوردستان) و تەنانەت لە نێوان خۆدی هەرێمی كوردستاندا!

### 6- هۆكاره یاساییەكان

قاچاغی مەوادی هۆشبەر بە هۆی گەشەكردنی تەكنۆلۆژی، باندەكانی مافیـایی و دەستە نهێنی و پشت پەردەكان، ئێستا بوەتە دیاردەیەكی ئالوز كـە ((نەتـەوە یەكگرتووەكان)) بە ((تاوانی رێكخراو))ی ناوناوە[63].

تا ئێستا چەندین رێككەوتن نامە و كونفرانسی نێودەوڵەتی (وەكـو: كۆنفرانـسی شانگهای چین (1909)، رێككـەوتن نامـاوە لاهـای هولەنـدا (1912)، پـەیمانی جنـێڤ لـە سـاڵەكانی (1925) و (1931) و (1971)، نەتەوەیـەكگرتووەكان (نیویۆرك1961) و...)[64] سەبارەت بە ماددە هۆشبەرەكان بەستراوە و هـەموویان ماددە هۆشبەرەكان بە تاوانكاری دەزانن، بە تایبەتی رێككەوتننامـەی كۆتـایی ((كونفرانسی گـشتی نەتـەوە یـەكگرتووەكان)) لـە سـاڵی (1984)[65]، هـەروەها ((كونفرانسی نێودەوڵەتی ماددە هۆشبەرەكان و بازرگانی قەدەغـەكراو)) لـە سـاڵی

63. بڕوانە: بوسار(آندره): بزهكاری بین المللی، ترجمەی نگار رخشانی - انتشارات كتابخانەی گنج دانش، تهران1375، ل73 تا 81.

64. بڕوانە: شعبان (د. صباح كرم): سەرچاوەی پێشوو، ل65 تا 75.

65. دانش (تاج زمان): سەرچاوەی پێشوو، ل237.

(1987) له شاری ڤییننا، کە بەیاننامەیەکیان دەرکرد سەبارەت بە بەرەنگار بوونەوەی ماددە هۆشبەرەکان کە بە کارهێنان و قاچاغ و بازرگانیکردن و بەرهەمهێنانی ماددە هۆشبەرەکان بە شتێکی نایاسایی و زیانبار لە قەڵەم درا[66].

بەشێکی گەورەی بەندیخانەکان لە هەموو وڵاتاندا ئەم تاقمە تاوانبارانە دەگرێتەوە، کە یان ئینتیمایان بۆ باندێکی قاچاغچییان هەبووە، یانیش تاکێکی سەربەخۆ و نارێکخراو بووە.. بۆیە هۆکاری یاسایش دەوری زۆرە لە سەرهەڵدانی ئەم کێشەیە، وەکو:

- نەبوونی یاسای گونجاو بۆ بەرەنگاری بوونەوەی لە ماددە هۆشبەرەکان: (بەرهەم هێنان، کڕین و فرۆشتن، ئامادەکردن، گواستنەوە، دەڵاڵی، بەکارهێنان).

- لاوازی و کەمتەر خەمی لایەنە پەیوەندیدارەکان لە جێبەجێ کردنی یاساکان.

66. ستودە (د. هدایت الله): سەرچاوە پێشوو، ل187.

# بەشی چوارەم: ئاسەواری خووپێوەگرتن

1- ئاسەواری جەستەیی

2- ئاسەواری دەروونی

3- ئاسەواری خێزانی

4- ئاسەوری کۆمەڵایەتی

5- ئاسەواری ئابووری

## بەشی چوارەم: ئاسەواری خووپێوەگرتن

**1- ئاسەواری جەستەیی**

ئەگەر خەرجی رۆژانەی خووگرێك رابگیرێ و لە 10 تا 12 کاتژمێر تێپەرێ، ئەوا تووشی کۆمەڵێك ماك و ئاسەواری جەستەیی دەبێت، وەکو: نارەحەتی، دەمارگرژی، دڵەراوکێ، بێئارامی، پێکژین، هاتنی ئاو لە لوت و چاو، ئێش و ئازاری ئەندامەکان، فشاری زۆر لە برپرە، سك ئێشە، بێ ئیشتیهایی، رەشانەوەی بەردەوام، کز و لاواز بوون، سووکبوونی کێش... دواتر لەرزین و جوڵانی بەهێز دەست پێدەکات و ئەگەر مەوادی پێویست نەگاتێ، ئەم رەقبوون و لەرزینەکان بەردەوام دەبێت لە رادەیەك کە زۆر جار لەگەڵ ئاسەورای نەخۆشی خو ((صرع)) بە هەڵە وەردەگیرێ! ئەگەر 2 تا 3 رۆژ لامادە هۆشبەری نەگاتێ، بە تایبەتی ئەوانەی کە لە سەرەتای خووپێوەگرتن دان و لە مێژ نییە تووشبوونە، خووپێوەگرتنەکەی لا دەچێ و نامێنێ، بەم مەرجە کە تاك بتوانێ بەرگەی بگرێ![67] چونکە نەگەیشتن بە مەواد نیشانە و ئاسەواری هەیە، بەڵام ((مردن و لە ناوچوون)) نییە[68]. باشترین نموونە ئەو خووگرانەن کە بەند دەکرێن و لە بەندیخانە دا ناچار دەکرێن کە واز بهێنن و نامرن.

**بەڵام ئەگەر واز نەهێنێ و درێژە بە خووپێوەگرتنەکەی بدات، تووشی هەندێ ئاسەواری نێگەتیڤی جەستەیی دەبێت**، لەوانە وەکو:

- زەرد بوون و رزینی ددانەکان.
- هەوکردنی دەم و لێو.

67. ستودە، سەرچاوە پێشوو، ل191.

68. فرجاد، سەرچاوەی پێشوو، ل160.

- کەمبوونەوەی دەردانی ناوی لیکە رژێنەکانی ناو دەم.
- بێهێزی و لاوازی لەش و کەمبوونەوەی کێشی جەستە.
- نەزۆکی بۆ پیاو و ئافرەت و لەبارچوون لە ژنان.
- کەمبوونەوەی ئارەزووی سێکسی.
- کەموکورتی و تێکچوونی کۆئەندامی دەمار.
- بە مۆمبوونی جەرگ (کبد). واتە ناتوانێ ئەنزیمی پێویست بڕژێنێت.
- زەردووی و کەمبوونەوەی رژێنەکانی ناو پانکریاس و ئاسەواری نێگەتیڤی تر لە سەر دەزگای هەرس.
- هەوکردن و ئاوسانی گورچیلەکان و کەموکورتی لە پاڵنانی میز و سووتانەوەی کۆئەندامی دەرەوەی میز.
- هەوکردنی درێژخایەنی گەروو.
- برۆنشێتی مزمن*.
- نەخۆشی ئاسم**، سیل، لێدانی دڵ، تەنگە نەفەس و، سەرگێژە.
- ووشکی پێست.
- جۆرەها شێرپەنجە و وەستانی دڵ.
- نادیار بوونی زۆر لە نەخۆشیە مەترسیدارەکان بە هۆی کەم بوونەی هەستی ئێش و ئازار.

---

* برۆنشێتی مزمن: بریتییە لە هەوکردنی بۆڕییەکانی هەناسەی خواروی درێژخایەن.
** نەخۆشیی ئاسم: بریتییە لە تەسکبوونی بۆڕییەکانی هەناسە لەناو سییەکان ئەویش بەهۆی لەرزی (الحساسیە).

– ئەگەر خووگرتووی لەوجۆرە بێت کە بە دەرزی لێدان مادەکە وەردەگرێت، ئەوا لە مەترسی نەخۆشی ئایدزیش دایە[69].

## 2- ئاسەواری دەروونی

هەر وەك پێشتر ئاماژەمان پێکرد، یەکێك لە هۆیەکانی خووپێوەگرتن بریتیە لە وابەستەیی و بەسترانەوەی دەروونی بە ماددە هۆشبەرەکانە ( Psychological dependence). هەر وەك لە بەشی هۆکارە دەروونییەکان باسمان کرد، نەخۆشییە دەروونییەکان یەکێك لە هۆیەکانی تووش بوونی ماددە هۆشبەرەکان، بەتایبەتی ئەوانەی کە ((کەسایەتی))یان کامل نەبووە و گەشەیان نەکردووە. ئەوانە زیاتر لە رووی دەروونییەوە بە ماددە هۆشبەرەکان پابەند و بەستراون تا لە رووی جەستەییەوە! ئەگەر تاکەکان بە شێوەیەکی دروست و پۆزەتیڤی پەروەردە بکرێن، هیچ کاتێك بۆ بالانس و هاوسەنگی دەروونی خۆی پەنا ناباتە بەر ماددە هۆشبەرەکان. تاکەکانی خووگرتوو لە دوای چەند ساڵێك تووشی جۆرەها نەخۆشی دەروونی دەبن کە لێرە ئاماژە بە هەندێ لەوانە دەکەین:

– تێکچوونی یەکسانی و هاوسەنگی دەروونی.
– گرنگی نەدان بە بەها و بنەما نەخلاقی و کۆمەڵایەتییەکان.
– لاوازی لە ئیرادە.
– نەمانی هەستی بەرپرسیارێتی.
– دروستبوونی هەستی دوژمنانە.
– بێ ئارامی.
– سەرکێشی و سەرپێچیکردن.

---

69. بڕوانە: العیسوی، سەرچاوەی پێشوو، فصلی «آثار الضارة للتدخین»، ل13 تا 38 - هەروەها ستودە، سەرچاوەی پێشوو، ل 191 و192 - هەروەها سایتی اطلاع رسانی نیروی انتظامی جمهوری اسلامی ایران» لە ئینتەرنێت:

http://www.police.ir/druqs/avarez.htm

- دڵەراوكێی بەردەوام.
- گۆشەگیری و تەنهایی، سۆزی و بێزاری لە خزم و کەس.
- خەوزڕان.
- فەرامۆشی و شپرزەیی لە فێربوون.
- نەخۆشی نوروتیك* و سایكۆپاتیك** و خەمۆکی...[70]

### 3- ئاسەواری خێزانی

بوونی تاکێکی خووگرتوو لە ناو خێزانێك دا دەبێتە هۆی ئاسەواری نێگەتیڤی جۆراوجۆر کە لێرە بە هەندێ لەوانە ئاماژە دەکەین:

- تێکچوونی شیرازەی خێزان.
- لاوازی و کەم بوونەوەی پەیوەندییەکان لە ناو خێزان.
- پەروەردە نەکردنی منداڵان بە شێوەیەکی دروست و پۆزەتیڤی.
- توندوتیژی و دروست کردنی کێشە لە ناو خێزان.
- کەم بوونەوەی ئاستی فەرهەنگی کۆمەڵایەتی و ئابووری خێزان.
- بەرزبوونەوی ڕێژەی جیابوونەوەی ژن و مێرد.
- کەمبوونەوەی ڕێژەی زەواج.
- دروستبوونی بێبەندوباری.

---

* نورتیك: بریتییە لە نەخۆشییەکی دەروونی سادە.

** سایكۆپاتیك: بریتییە لەو نەخۆشییەی کە نەخۆش هەڵسوکەوتی نالەبار لەگەڵ دەوروبەرەکەیدا مومارەسە دەکات، وەك برادەر و لێپرسراو و مامۆستا ...

70. بڕوانە: المغربي، سەرچاوەی پێشوو، ل17- هەروەها فرجاد، سەرچاوەی پێشوو، ل160 و 161- هەروەها ستودە، سەرچاوەی پێشوو، ل192 و 193- هەروەها سایتی اطلاع رسانی نیروی انتظامی جمهوری اسلامي ایران» لە ئینتەرنێت: http://www.police.ir/druqs/avarez.htm

## 4- ئاسەواری کۆمەڵایەتی

هەروەك توێژینەوەی جۆراوجۆر - و تێبینی ئێمە وەکو توێژەری کۆمەڵایەتی- پێشان دەدات کە تاکی خووگرتوو لە رووی پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکان زۆر لاوازە و تاکێکی گوشەگیر و وەلاوەنراو و قێزەوەن دەژمێردرێت! و جۆرەها کێشە و گرفتی تر وەك: تێکچوونی خێزان، تەڵاق، هەژاری، بێکاری، دزی، خۆکوژی، کوشتنی ژن یان مێرد و منداڵ، قاچاغ کردن و تووشی بەندیخانە بوون و...

تەنانەت لە کاتێ ((هاوسەرگیریدا)) هەر کەسێك ئامادە نابێت لەگەڵ ئەم جۆرە تاکانە ژیانێکی هاوبەش پێك بهێنێت! زۆر جار ئەم کەسانە لە رووی پیشە و کارکردنیشەوە بە هۆی چەندین هۆکاری پێکەوە بەستراو تووشی ((بێکاری)) دەبن. لە ئێران تێستێك هەیە بە ناوی ((تێستی مادده هۆشبەرەکان)) کە ئاشکرا دەبێت چ کەسێك خووگرتووە و تەنانەت جۆری مواددی بەکارهێنراویش دیار دەکات! ئەگەر کەسێك خووگرتوو بوو ئەوا هیچ پیشە و کارێکی نادەنێ، یاخود لە سەر کارەکەی دەردەکەن!

هەروەك ئاماژەمان پێکرد، راستەوخۆ و ناراستەوخۆ کاریش دەکاتە سەر رێژەی تاوان و تاوانباران و بەندکراوەکان[71]. چونکە دەبینین بەشێکی -زۆر یان کەم- لە بەندکراوەکان، تاکەکانی خووگرتوو یان ئەوانەی کرین و فرۆشتنی پێدەکان، دەگرێتەوە!

هەر کەس لە ناو هەر کۆمەڵگایەك دا بۆ ماوەیەکی زەمەنی و تەمنێکی دیاریکراو تاکێکی بەکاربەر و کۆمەڵگاش لە زۆر روویەوە سەرمایەگوزاری بۆ دەکات، وەکو بواری: تەندروستی، پەروەردە و فێرکردن، خزمەتگوزارییە

---

71. بڕوانە: شفرز (برنهارد): مبانی جامعه شناسی جوانان، ترجمەی کرامت الله راسخ - نشرنی، تهران 1383، ل 231 تا238.

جۆراوجۆرەکـان و... بـەو نومیـدە کـە رۆژێـك ببێتـە تـاکێکی بـە سـوود و بەرهەمهێنەر بۆ کۆمەڵگایەکەی. بەڵام ئەوەنـدەی لـە نزیکـەوە خووگرتووەکـان دەبینین و دەناسین، نەك تەنها هیچ بەرهەمێکیان نییە، بەڵکو بریتین لـە هەنـدێ مشەخۆر و بونەوەری بەکابەر کە تەنها زیان دەگەیـننە کۆمەڵگاکەیان!

پێشتر ئاماژەمان بەوە کرد کە لە ناو هەر چین و توێژی کۆمەڵایەتیدا خووگرتـوو دەبینرێ، بەڵام پێمان وایە جۆری ((کار و پیشە)) پەیوەنـدی بـە مـەیل یـان بـێ مەیلی بۆ ماددە هۆشبەرەکان هەیە، ئەگەر چی ناکرێ بڵـێین: ئـەوە یاسـایەکە و دەبێ گـشتگیر بکـرێ! بـۆ نموونـە تاکـەکانی خووگرتـوو لـە چـینە بـەرزەکان و خۆشگوزەران دا زیاتر موزیسیەنەکان و ئەوانەی مۆزیکژەنن، هەروەها هەندێ لە هونەرمەندە ئاست نزمەکان پێکدەهێنن، بە تایبەتی ئەگەر لـەو کۆمەڵگایـەدا، ((هونەر بۆ هونەر)) بێت، نەك لە خزمەتی خەڵك و کۆمەڵگا!![72].

بەڵام زۆربەی خووگرتووەکان بێکارن و ئەگەر کارێکیش بکـەن، ئـەوا بریتیـە لـە کڕین و فرۆشتن و دابەش کردنی مـاددە هۆشـبەرەکان! حـەز لـە کـار و خوێنـدن ناکەن، ئەوەش کار دەکاتە سەر پرۆسەی گەشە کردنی ئـابووری و کۆمەڵایـەتی و فەرهەنگی کۆمەڵگا، و هەروەها کۆمەڵێك ئاسەواری تر کە لە خـوارەوە ئامـاژە بە هەندێکیان دەکەین:

- هەست بە بەرپرسیارێتی نەکردن بەرامبەر بە کۆمەڵگا.
- لاواز بوونی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییـەکان و نـەمانی ئینتمـا بـۆ نەتـەوە و حکومەت و کۆمەڵگا بە گشتی.
- بەرز بوونەوە و فراوان بوونی رێژەی تاوان و تاوانباران و بەندکراوەکان.
- بڵاوبوونەوەی نەخۆشییە درمەکان و مەترسیدار وەك: ئایدز و هپاتیت و...

72. نموونەی ئەو جۆرە هونەرمەندانە لە ساڵی 2006 لە رۆژنامەکانمان بینی کە چون بە هۆی ماددە هۆشبەرەکان گیراون!!

- بێبەشبوونی نەوەی ئایندە لە پەروەردەی دروست و گونجاو.
- دروست بوونی پیشەی درۆ.
- کەم بوونەوەی ئاستی بژێوی و خۆشگوزەرانی کۆمەڵایەتی.
- نەمانی متمانە لە نێوان خەڵك.
- کەمبوونەوەی ئاسایش لە نێوان خەڵك و...

### 5- ئاسەواری ئابووری

ئاسەواری ئابووری، بەشێکی تری ئاسەوارەکانی ماددە هۆشبەرەکانە کە هەم بە سەبارەت تاك و هەمیش کۆمەڵگا گرنگییەکی زۆر هەیە. چونکە تاکی خووگرتوو ناتوانێ کار بکات (بە هۆی نەبوونی هێزی کار و هیچ بەرهەمێکی نابێت). یاخود بە هۆی تاوانی ماددە هۆشبەرەکان، بەشێکی زۆر یان کەم لە ژیانی خۆی لە ناو زیندان دا دەباتە سەر، ئەوەش خۆی لە خۆیدا هەم کێشەیەکی کۆمەڵایەتیە و هەمیش ئابووری.

جگە لەوە زۆربەی ئەم مەوادە لە رووی ئابوورییەوە زۆر بەنرخ و ئایابن! تاکی خووگرتوو ناچارە هەرچی هەیە لە پێناو بە دەست هێنانی ئەم مادەیەدا - بۆ شتێکی کەم، تەنانەت مسقاڵێك (Fix) پارەیەکی زۆر سەرف بکات[73]. بۆیە زۆربەی داهاتی تاکی و خێزانی خۆی لەو بوارەدا دوکەڵ دەکات و تووشی خسارەتی تاکی و خێزانی و تەنانەت نەتەوەیی دەبێت.. بۆ نموونە: لە ئەمریکا نزیکەی 14 ملیۆن کەس خووگرتوو هەن کە بە بەردەوام یەکێك لە مادەی هۆشبەر بەکاردەهێنن و زیاتر لە 50 ملیارد دۆلار ساڵانە خەرجی ئەم مەوادە دەکەن![74].

---

73. آبادینسکی (هووارد): جامعە شناسی مواد مخدر، ترجمەی محمد علی زکریایی - ستاد مبارزە با مواد مخدر، تهران1382، ل16.
74. برومند (د. شهزاد): بررسی اقتصادی رفتار مصرف کنندگان مواد مخدر - ستاد مبارزە با مواد مخدر، تهران1383، ل2.

دەکرێ ئاسەواری نێگەتیڤی ئابووری بەم خاڵانەی خوارەوە کورت بکەینەوە:

- خەرجی زۆر لە کڕین و بەدەست هێنانی مەوادی هۆشبەر.
- خەرجی دەرمان و راگرتنیان لە شوێنە پەیوەندارەکان.
- کەمبوونەوەی رێژەی بەرهەمهێنان.
- خەرجی بەرەنگاری مادده هۆشبەرەکان لە سنورەکان و لە ناو شارەکان.
- خەرجی دادگاکان و پارێزەران.
- سەرەنجام کەمبوونەوەی داهاتی تاکەکەس و خێزان و کۆمەڵگا.

# دەروازەی دووەم: لایەنی مەیدانی

## بەشی پێنجەم: ئیجرائاتی میتۆدی لێکۆڵینەوە

1- میتۆدی لێکۆڵینەوە

2- کۆمەلگا و نموونەی لێکۆڵینەوە

3- بوارەکانی لێکۆڵینەوە

4- ئامرازەکانی کۆکردنەوەی زانیارییەکان

# بەشی پێنجەم: ئیجرائاتی میتۆدی لێکۆڵینەوە

## 1- میتۆدی لێکۆڵینەوە

لە بەشی مەیدانی لێکۆڵینەوەکەمان میتۆدی (Case study) ((لێکۆڵینەوەی بار))مان هەلبژارد، چونکە تەنها ((6)) نمونەمان هەبوو.

میتۆدی ((لێکۆڵینەوەی بار)) یەکێك لە میتۆدەکانی لێکۆڵینەوەیە لە زانستە کۆمەڵایەتی بە تایبەتی زانستە رەفتارییەکان، کە بریتیە لە کۆکردنەوەی زانیاری سەبارەت بە حالەتیکی دیاریکراو[75].

ئەم میتۆدە کاتێك بەکار دێت کە ژمارەی نمونەی لێکۆڵینەوە کەم بێت و نەتوانرێ پرسیارنامە بە کار بهێنرێ. بۆیە توێژەری کۆمەڵایەتی چەند نمونە و حاڵەتێکی دیاریکراو وەردەگرێ و لە چەندین لایەنەوە لێدەکۆڵێتەوە. ئامانجی سەرەکی لەو میتۆدەدا تێبینیکردنی گشتی رەهەندە جیاجیاکانی حاڵەتی لێکۆڵینەوەکەیە و دواتر شیکردنەوەی ئەم تێبینیانەیە. بۆیە لێکۆڵینەوەی بار میتۆدێکی چۆنیەتییە و جەخت لەسەر پرۆسەکان و هۆکارەکان و تێگەیشتن و شیکردنەومیان دەکاتەوە. نمونە و حاڵەتەکە بەشێوەیەك هەڵدەبژێرێ کە نیشاندەری بارودۆخی گشتی لێکۆڵینەوەکەیە یاخود نمونە لەو دیاردەیانەیە کە توێژەر دەیەوێ بە شێوەیەکی قووڵ لێکۆڵینەوەیان لەسەر بکات[76].

ئامانجی توێژەری کۆمەڵایەتی لە بەکارهێنانی میتۆدی لێکۆڵینەوەی بار ئەوەیە کە وەلامی ئەو پرسیارانە بداتەوە: بۆ چی و چۆن ئەم دیاردەیە سەریهەڵداوە؟ یاخود چی روویداوە؟ بۆچی روویداوە؟ و چۆن روویداوە؟[77].

---

75. دی ولس (دی. ای): پیمایش در تحقیقات اجتماعی، ترجمەی هوشنگ نایبی - نشرنی، تهران1383، ل15.

76. سرمد (د. زهره) و ئەوانی تر: روشهای تحقیق در علوم رفتاری - نشر آگه، تهران،1383، ل89.

77. سەرچاوەی پێشوو، ل90.

### 2- کۆمەڵگا و نموونەی لێکۆڵینەوە

((کۆمەڵگای لێکۆڵینەوە)) بریتیە لەو کومەلگایەی کە توێژەری کۆمەڵایەتی تێدا لێکۆڵینەوەی خۆی ئەنجام دەدات و نموونەی لێکۆلینەوەی تیدا هەلدەبژێرێت.

کۆمەڵگای لێکۆڵینەوەکەمان بریتی بوو لە ((ئاسایشی گشتی هەولێر)) چونکە تەنها لەو شوێنە دا هەندێ خووگرتووی بەندکراو هەبوو کە ژمارەیان ((6)) کەس بوو. لە ((زیندانی محطـة)) هەندێ بەندکراوی تر هەبوو، بەڵام ئەوان خووگرتوو نەبوون، بەڵکو قاچاغچی ماددە هۆشبەرەکان بوون، واتە ئەوانەی بازرگانی وکڕینی و فروشتن بەم مەوادە دەکەن یاخود لە ئەو دیوی کوردستان کە لە ئیرانەوە دەیهێنن.

### 3- بوارەکانی لێکۆڵینەوە

1. **بواری مرۆیی**: بریتیە لەو خووگرتووانەی کە لە ئاسایشی هەولێر بەندکراون.
2. **بواری شوێنی**: بریتیە لە ئاسایشی گشتی هەولێر، شوێنی راگرتنیخووگرتووەکان.
3. **بواری کاتی**: لێکۆڵینەوەکەمان دەستی پێکرد لە رێکەوتی 2006/4/12 تاکو 2006/5/28.

### 4- ئامرازەکانی کۆکردنەوەی زانیارییەکان

لە میتۆدی لێکۆڵینەوەی بار دا توێژەری کۆمەڵایەتی دەتوانێ 3 ئامرازی کۆکردنەوەی زانیاری سەبارت بە باسەکەی بەکار بهێنێ کە بریتین لە: ((پرسیارنامە))، ((چاوپێکەوتن)) و ((تێبینیکردن))[78]، کە ئێمە بە حوکمی توێژینەوەکەمان دوو ئامرازی چاوپێکەوتن و تێبینیکردنمان بە کار هێناوە:

---

78. دی واس، سەرچاوەی پێشوو، ل16.

### 1- تێبینیکردن (Observation)

گرنگترین ئامرازی کۆکردنەوەی زانیارییەکانە کە لە زانستە رەفتارییەکان بە تایبەتی لە دەروونناسی دا بەکاردێت. تێبینی کردن بریتیە لە زانین و بەراوردکردن و وەسف کردن و نووسینی هەموو ئەو شتانەی کە روودەدەن[79].

هەموو زانستە کۆمەڵایەتیەکان بە ((تێبینیکردن)) دەست پێدەکەن و بەوەش تەواو دەبن، تایبەتمەندی سەرەکی تیبینیکردن، ((راستەخۆ)) بوونە، چونکە دەکرێ لێکۆڵینەوەی رەفتاری تاکەکان بە شێوەیەکی راستەوخۆ بکرێت و ئیتر پێویست ناکات توێژەر سەبارەت بە رەفتار و هەڵسوکەوتی تاکەکان لە خەڵکانی تر پرسیار بکات. بۆیە لەم رێگایەوە دەتوانێ سەرەتایی ترین زانیاری وەربگرێ[80].

**ئامرازی تێبینی کردن بە دوو جۆری سەرەکی دابەش دەبێت کە بریتین لە:**

((تێبینی کردنی سادە)) (Simple Observation) کە زیاتر بەشێوەیەکی لە خۆوەیی لە بارودوخێکی سروشتی دا بە بێ بەکار هێنانی ئامرازی میکانیکی وەکو تۆمارکراوەکان وکامێرا و... ئەنجام دەبێت و زیاتر لە لێکۆڵینەوەی بەرایی بەکاردێت. کەچی ((تێبینیکردنی رێکخراو)) (Systematic Observation) زانستییانەتر و بە بەرنامەتر و ئاراستەکراوە کە تیایدا ((کات)) و ((شوێن)) دیار دەکرێ و لەوانەیە ئامرازی میکانیکی بۆ تۆمارکردنی دەنگ و وێنەگرتن بەکاربێت[81]. کە ئێمە لە لێکۆڵینەوەکەمان ئەم جۆرە تێبینی کردنە (واتە جۆری رێکخراو)مان بەکار هێناوە، چونکە پێشتر پرسیارمان ئامادە کردبوو، کات و

---

79. سەرمد و ئەوانی تر، سەرچاوەی پێشوو، ل151.

80. فرانکفورد (چاوا) و نچمیاس (دیوید): روشهای پژوهش در علوم اجتماعی، ترجمەی د.فاضل لاریجانی و ئەوانی تر، انتشارات سروش، تهران 1381، ل296.

81. الرفاعی (د. أحمد حسین): مناهج البحث العلمی - دار وائل، عمان1999، ل221 تا 224.

شوێنی تێبینی کردن دیاری کرابوو، بە شێوەیەکی ڕێکخراو زانیارییەکان و تێبینی یەکانمان نووسی. بۆ نموونە حاڵەتی ڕەوالەتی جەستەیی و دەروونی یەك بە یەك لە خووگرتووەکانمان نووسی.

2- **چاوپێکەوتن:** (Interview)

یەکێك لە گرنگترین ئامرازی کۆکردنەوەی زانیارییە کە توێژەر دەتوانێ ڕاستەوخۆ لەگەڵ تاکی لێتوێژەر دابنیشێت و گفتوگۆ بکات و دواتر بە شێوەیەکی وورد توێژینەوەی بابەتەکانی نادیار بکات و هۆکارەکانی دەست نیشان بکات[82].

چاوپێکەوتن، پەیوەندی لە نێوان دوو کەسە لە بەردەم یەکتر. لەو حاڵەتەدا توێژەر پرسیارەکانی خۆی کە پێشتر ئامادەکراون لە لێتوێژەر دەپرسێ, پرسیارەکان و ووشەکان و شێوازی ئاراستەکردنیان، جۆری ئەنجام دانی چاوپێکەوتنی دیار دەکەن[83].

چاوپێکەوتنیش دوو جۆرە کە بریتین لە: ((چاوپێکەوتنی ڕێکخراو)) و ((چاوپێکەوتنی نارێکخراو))، کە هەریەکیان تایبەتمەندی خۆی هەیە[84] و، ئێمە لە کاتێ سەردانی ((ئاسایشی گشتی هەولێر)) کە لەگەڵ 6 تاکی خووگرتوو چاوپێکەوتنمان ئەنجام دا، جۆری ڕێکخراومان بەکار هێنا. چونکە پرسیارەکان پێشتر ئامادە کرابوون و هەریەك لەو خووگرتووانە وەڵامی هەمان پرسیاریان دەدایەوە بە شێوەیەك کە دەقاو دەق پرسیارەکان بۆ هەموویان هاوبەش و یەکسان بوو.

---

82. سەرمەد و ئەوانی تر، سەرچاوەی پێشوو، ل149.

83. فرانکفورد و نچمیاس، سەرچاوەی پێشوو، ل334.

84. بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو، ل334 و 335.

# بەشی شەشەم: خستنەروو و شیکردنەوەی زانیارییەکان

1- خستنەرووی زانیارییەکان

2- دەرئەنجامەکان و پێشنیارەکان

# بەشی شەشەم: خستنەروو و شیکردنەوەی زانیارییەکان

## 1- خستنەرووی زانیارییەکان

نێستا یەك بە یەك لەو خووگرتووانەی (کە هەموویان پیاو بوون) و لە ناسایشی گشتی هەولێر (چاوپێکەوتن)مان لەگەڵ کردوون و کۆمەڵێك پرسیاری گشتی و تایبەتمان ئاراستەکردن، لە خوارەوە وەڵامەکانیان دەخەینەروو و دواتر شییان دەکەینەوە:

### 1- لێکۆڵینەوەی باری یەکەم

تەمەنم (23) ساڵە و هێشتا ژنم نەهێناوە.. نێستا دانیشتووی قەزای (دیانا)م و لە خانوویەکی کرێ دام.. پێشتر ئاوارەی ((ئێران)) بووم لە ساڵی (1983) و لە شاری ((ئیسفەهان)) نیشتەجێ بووین و لە ساڵی (2005) گەڕاومەتەوە.. تەمەنم (11) ساڵ بوو کە قوتابخانەم بە جێ هێشت و نێستا ئاستی خوێندەواریم ((سەرەتاییە)). پێش کە بکەومە ناو زیندان (واتە ئەو کاتە کە لە ئێران بووم)، کاری ئازادم دەکرد و کرێکاری ئاسایی بووم.. داهاتی مانگانەم (250000) تومانی ئێرانی (نزیکەی 270$) بوو.. هۆی ئەوەی کە هاتوومەتە ناو زیندان، بەکارهێنانی ماددە هۆشبەرەکان بوو لە دیانا.. یەکەمجار کە بە کارم هێنا بەر لە (3) ساڵ پێش بوو کە بەهۆی دوو برادەرم لە ئیسفەهان فێری ماددە هۆشبەرەکان بووم.. زۆر هاتووچۆی ئەوانەم دەکرد و بە قسەی وانم کرد، دەیانگووت: زۆر خۆشە و حاڵەتێکی خەیاڵیت بۆ دروست دەکات!.. پێش لە ماددە هۆشبەرەکانیش ((جگەرەم)) بەکار دەهێنا، ڕۆژانە (20) دانە.. نێستاش ((جگەرە)) و ((تریاك)) بەکار دەبەم.. لە ڕێگای کێشان، هەندێ جاریش لە ناو ((چای)) دەکەم و دەیخوومەوە. مانگانە نزیکەی (60000) تومان (70$)م بە

تریاك دەدا.. دەمزانی کە بەکار هێنانی ئەم جۆرە مەوادده دەبێتە هۆی خووپێوەگرتن، بەڵام بە راستی نەمدەزانی کە ئاسەوار و دەرەنجامەکانی ئەوەندە نێگەتیڤی و زەرەرمەندن.. پەیوەندی کۆمەڵایەتیم لەگەڵ دایك و باوکم زۆر باش نەبوو، بە تایبەتی لەگەڵ برام.. خێزانی ئێمە لە رووی ئایینییەوە زۆر پابەند نەبوون. من هیچ ئاگاداری ئەوە نەبووم کە ئاین رێگرە لە بەردەم بەکارهێنانی مادده هۆشبەرەکان، واتە نەمدەزانی ئیسلام حەرامی کردووە.. بەڵام دەمزانی کە شتێکی ناقانونیە و ئەگەر بێتو ئاشکرا بم، دەمگرن!.. دەست بەتاڵی خۆم زیاتر بە کێشانی مەواد و خەوتن پڕ دەکردەوە، ئێستاش زۆر پەشیمانم!.. بۆ ئەوەی خەڵکانی دیکە بە تایبەتی گەنجەکان وەکو من تووش نەبن، پێیان دەڵێم:

1. ئەوانەی کە ئەو کارە دەکەن، هەڵەیەکی گەورە دەکەن!
2. ئەوەی کە ئەو کارەی دەکات، سزا بدرێت و بخرێتە ناو زیندان و ئازادی نەکەن!
3. ئیرادەیان هەبێت و جگەرە و تریاك فڕە بدەن!

## 2- لێکۆڵینەوەی باری دووەم

تەمەنم (23) ساڵە و هێشتا ژنم نەهێناوە.. ئێستا دانیشتووی قەزای (دیانا)م و لە خانوویەکی کرێ دام.. پێشتر ئاوارەی ((ئێران)) بووم و لە شاری ((ئیسفەهان)) نیشتەجێ بووین و لە ساڵی (2000) گەڕاومەتەوە.. تەمەنم (17) ساڵ بوو کە قوتابخانەم بە جێ هێشت و ئێستا ئاستی خوێندەواریم ((ناوەندییە)). پێش کە بکەومە ناو زیندان، پێشمەرگە بووم و بەردەستی باوکم بووم کە کاری چێشتلێنەر دەکات بۆ بارەگای پێشمەرگەکان.. داهاتی مانگانەم (225000) دیناری نوێ (نزیکەی $150) بوو.. هۆی ئەوەی کە هاتوومەتە ناو زیندان، بەکارهێنانی مادده هۆشبەرەکان بوو لە دیانا.. یەکەم جار کە بە کارم هێنا لە ساڵی (2002) بوو لە دیانا کە بەهۆی برادەرم کە خزمیشم بوو، فێر کرام.. ئەویش چەند برادەری هەبوون کە هەموویان خووگرتوو بوون، ئەوان لە ئێران

خووگر ببوون.. پێش لە مادده هۆشبەرەکانیش ((جگەرەم)) بەکار دەهێنا، رۆژانە (40) دانە.. ئێستاش ((جگەرە)) و ((تریاك)) و ((هرۆئین)) و ((حەشیش)) بەکار دەبەم.. تریاك و حەشیش لە ڕێگای کێشان، هەرۆئین لە ڕێگای دەرزی لێدان. مانگانە نزیکەی (30000) دینار (20$)م بە هرۆئین دەدا.. دەمزانی کە بەکار هێنانی ئەم جۆرە مەوادده دەبێتە هۆی خووپێوەگرتن بوونم، بەڵام نەمدەزانی کە ئاسەوار و دەرەنجامەکانی ئەوەندە نێگەتیڤی و زەرەرمەندن.. پەیوەندی کۆمەڵایەتیم لەگەڵ دایك و باوکم باش بوو، باوکم هەموو شتێکی کە دەمویست بۆی فەراهەم دەکردم. خێزانی ئێمە لە رووی ئایینییەوە زۆر پابەند نەبوون و لاواز بوون. من هیچ ئاگاداری ئەوە نەبووم کە ئایین ڕێگرە لە بەردەم بەکارهێنانی مادده هۆشبەرەکان، واتە نەمدەزانی ئیسلام حەرامی کردووە، چونکە گرنگیم بەو شتانە نەدەدا.. بەڵام دەمزانی کە شتێکی نایاساییە و ئەگەر ئاشکرا بم، دەمگرن!.. دەست بەتاڵی خۆم زیاتر بە گەڕان لەگەڵ برادەرەکانم پڕ دەکردەوە، ئێستاش زۆر پەشیمانم!.. بۆ ئەوەی خەڵکانی دیکە بە تایبەتی گەنجەکان وەکو من تووش نەبن، پێیان دەڵێم:

1. بەرامبەری ئەوان بوەستن کە بەکاری دەهێنن!
2. بەرامبەر ئەوانیش بوەستن کە ئەم جۆرە مەوادە لە سنوورەکان دەهێنن!

### 3- لێکۆڵینەوەی باری سێیەم

تەمەنم (29) ساڵە و ژنم هێناوە و خاوەن منداڵێکم.. ئێستا دانیشتووی قەزای (دیانا)م و لە خانوویەکی کرێ دام.. پێشتر ئاوارەی ((ئێران)) بووم و لە شاری ((ورمێ)) نیشتەجێ بووین و لە ساڵی (2005) گەڕاومەتەوە.. هەتا ((ناوەندی))م خوێندووە. پێش کە بکەومە ناو زیندان (واتە ئەو کاتە کە لە ئێران بووم)، کاری ئازادم دەکرد و کاشیکار (وەستای کاشی) بووم.. داهاتی مانگانەم (750000) دیناری نوێ (نزیکەی 500$) بوو.. هۆی ئەوەی کە هاتوومەتە ناو زیندان،

بەکارهێنانی ماددە هۆشبەرەکان بوو لە دیانا.. یەکەم جار کە بە کارم هێنا بەر لە (2) ساڵ پێش بوو کە بەهۆی (7) برادەرم لە ورمێ فێری ماددە هۆشبەرەکان بووم.. زۆر هاتووچۆی ئەوانەم دەکرد و بە قسەی وانم کرد، دەیانگووت: حەزی سێکسیت بەهێز دەکات! چێژێکی وەکو چێژی سێکسیت بۆ دروست دەکات، و لە کارەکەت هیچ ماندوو نابی و تەنانەت دەتوانی 24 کاتژمێر کار بکەیت!.. پێش لە ماددە هۆشبەرەکانیش ((جگەرەم)) بەکار دەهێنا، رۆژانە (10) دانە. ئێستاش ((جگەرە)) و ((تریاك)) بەکار دەبەم.. لە رێگای کێشان، هەندێ جاریش تریاك لە ناو ناوی کوڵاو دەکەم و بە دەرزی لێدەدەم! مانگانە نزیکەی (75000) تایینار ($50)م بە تریاك دەدا.. دەمزانی کە بەکار هێنانی ئەم جۆرە مەوادە دەبێتە هۆی خووپێوەگرتن بوونم، تەنانەت دەمدەزانی کە ئاسەوار و دەرەنجامەکانیشی ئەوەندە نێگەتیڤی و زەرەرمەندن.. باوکم هەر لە منداڵیمەوە نەما بوو. پەیوەندی کۆمەڵایەتیم لەگەڵ دایکم زۆر باش نەبوو.. لە دوای دەست پێکردنم، پەیوەندی هاوسەرەکەشم لەگەڵم دا وەکو پێش نەما! خێزانی ئێمە لە رووی ئایینییەوە باش بوون. من هیچ ئاگاداری ئەوە نەبووم کە ئایین رێگرە لە بەردەم بەکارهێنانی ماددە هۆشبەرەکان، واتە نەمدەزانی ئیسلام حەرامی کردووە.. بەڵام دەمزانی کە شتێکی نایاسایە و ئەگەر بێتو ئاشکرا بم، دەمگرن!.. دەست بەتاڵی خۆم زیاتر تەماشا کردنی سەتەلایت پڕ دەکەمەوە، ئێستاش زۆر پەشیمانم!.. بۆ ئەوەی خەڵکانی دیکە بە تایبەتی گەنجەکان وەکو من تووش نەبن، پێیان دەڵێم:

1. هەتا بکرێت توندبن بکەن!
2. خەڵکی فێری کاری باش بکەن!

### 4- لێکۆڵینەوەی باری چوارەم

تەمەنم (34) ساڵە و خێزاندارم و (2) منداڵم هەیە.. ئێستا دانیشتووی قەزای (بنەسلاوە)م و خانوو هی خۆمە.. پێشتر ئاوارەی ((ئێران)) بووم و لە شاری ((جهرم)) نیشتەجێ بووین و لە ساڵی (2000) گەراومەتەوە.. تەمەنم (13) ساڵ بوو کە قوتابخانەم بە جێ هێشت و ئێستا ئاستی خوێندەواریم ((سەرەتاییە)).. پێش کە بکەومە ناو زیندان، پێشمەرگە بووم.. داهاتی مانگانەم (230000) دیناری نوێ (نزیکەی 150$) بوو.. هۆی ئەوەی کە هاتوومەتە ناو زیندان، بەکارهێنانی ماددە هۆشبەرەکان بوو لە بنەسلاوە.. یەکەمجار کە بە کارم هێنا بەر لە (3) ساڵ پێش بوو کە بەهۆی (5) برادەر فێری بووم.. زۆر هاتووچۆی ئەوانەم دەکرد و فریوی قسەکانیانم خوارد! بۆ نموونە دەیانگووت: هەست بە هیچ کێشەیەك ناکەیت!.. پێش لە ماددە هۆشبەرەکانیش ((جگەرەم)) بەکار دەهێنا، رۆژانە (20) دانە. ئێستاش ((جگەرە)) و ((تریاك)) بەکار دەبەم. لە رێگای کێشان. مانگانە نزیکەی (250000) تومان (160$)م بە تریاك دەدا.. ئەمدەزانی کە بەکار هێنانی ئەم جۆرە مەوادده دەبێتە هۆی خووپێوەگرتن بوونم، هەروەها ئەمدەزانی کە ئاسەوار و دەرەنجامەکانی ئەوەندە نێگەتیڤی و زەرەرمەندن.. پەیوەندی کۆمەڵایەتیم لەگەڵ خێزانم خراپ بوو، بە تایبەتی لەگەڵ هاوسەرەکەم دوای ئەوەی کە خووگرتوو بووم، جارێك هەوڵی خۆکوژی دا، هێزی سێکسیم نەماوە!.. خێزانی ئێمە لە رووی ئایینییەوە هیچ پابەند نەبوون. من هیچ ئاگاداری ئەوە نەبووم کە ئایین رێگرە لە بەردەم بەکارهێنانی ماددە هۆشبەرەکان، واتە ئەمدەزانی ئیسلام حەرامی کردووە، بۆ من ئایین هیچ مانایەکی ئەوتۆی نەبوو.. بەڵام دەمزانی کە شتێکی نایاساییە و ئەگەر بێتو ئاشکرا بم، دەمگرن!.. دەست بەتاڵی خۆم زیاتر بە کێشانی مەواد و تەماشاکردنی سەتەلایت پڕ دەکردەوە، ئێستاش زۆر پەشیمانم!.. بۆ ئەوەی خەڵکانی دیکە بە تایبەتی گەنجەکان وەکو من تووش نەبن، پێیان دەڵێم:

1. خەڵك ئاگايان لە خۆ بێت، هەر کە کێشايان تووش دەبن!
2. ئەگەریش تووش بوو، ئەوا ماڵی کاوڵ دەبێت!

## 5- لێکۆڵینەوەی باری پێنجەم

تەمەنم (30) ساڵە و خێزاندارم و (2) منداڵم هەیە.. ئێستا دانیشتووی قەزای (بنەسڵاوە)م و لە خانوویەکی کرێ دام.. پێشتر ئاوارەی ((ئێران)) بووم و لە شاری ((شیراز)) نیشتەجێ بووین و لە ساڵی (2004) گەڕاومەتەوە.. قۆناغی ((ئامادەیی))م تەواو کردووە.. پێش کە بکەومە ناو زیندان، پێشمەرگە بووم.. داهاتی مانگانەم (330000) دیناری نوێ (نزیکەی 220$) بوو، بەڵام لە ئێران لە نانەواییەکم ئیش دەکرد.. هۆی ئەوەی کە هاتوومەتە ناو زیندان، بەکارهێنانی ماددە هۆشبەرەکان بوو لە بنەسڵاوە.. یەکەمجار کە بە کارم هێنا بەر لە (3) ساڵ پێش بوو کە بەهۆی (7) برادەرم لە شیراز فێری ماددە هۆشبەرەکان بووم، هەر لەو نانەواییەدا فێر کرام.. زۆر حەزم دەکرد بزانم ئەو ماددەیە چییە کە ئەوندە باسی لێی دەکرێ.. پێش لە ماددە هۆشبەرەکانیش ((جگەرەم)) بەکار نەدەهێنا.. ئێستاش ((تریاك)) بەکار دەبەم.. لە ڕێگای کێشان، هەندێ جاریش خواردن.. مانگانە نزیکەی (50000) تومان (65$)م بە تریاك دەدا.. ئەمدەمزانی کە بەکارهێنانی ئەم جۆرە موادە دەبێتە هۆی خووپێوەگرتن بوونم، تەنانەت ئەمدەزانی کە ئاسەوار و دەرەنجامەکانی ئەوەندە نێگەتیڤی و زەرەرمەندن.. پەیوەندی کۆمەڵایەتیم لەگەڵ دایك و باوکم زۆر باش نەبوو، بە تایبەتی لەگەڵ هاوسەرەکم لە دوای خووپێوەگرتنم، خێزانی ئێمە لە ڕووی ئاینییەوە زۆر پابەند نەبوون. من هیچ ئاگاداری ئەوە نەبووم کە ئاین ڕێگرە لە بەردەم بەکارهێنانی ماددە هۆشبەرەکان، واتە نەمدەزانی ئیسلام حەرامی کردووە و بۆ من گرنگ نەبوو بزانم ڕای ئاین چییە.. بەڵام دەمزانی کە شتێکی ناقانونیە و ئەگەر بێتو ئاشکرا بم، دەمگرن!.. دەست بەتاڵی خۆم زیاتر

بە گەڕان و تەماشاکردنی سەتەلایت پڕ دەکردەوە، ئێستاش زۆر پەشیمانم!.. بۆ ئەوەی خەڵکانی دیکە بە تایبەتی گەنجەکان وەکو من تووش نەبن، پێیان دەڵێم:

1. حکومەت زیاتر گرنگی بە گەنجەکان بدات، پارك دروست بکات، گرنگی بە وەرزش بدات!
2. هوشیار کردنەوەی خەڵك!

## 6- لێکۆڵینەوەی باری شەشەم

تەمەنم (27) ساڵە و خێزاندارم و (1) منداڵم هەیە.. ئێستا دانیشتووی قەزای (بنەسلاوە)م و لە خانوویەکی کرێ دام.. پێشتر ئاوارەی ((ئێران)) بووم و لە شاری ((شێراز)) نیشتەجێ بووین و لە ساڵی (2004) گەڕاومەتەوە. قۆناغی ((ناوەندی))م تەواو کردووە.. پێش کە بکەومە ناو زیندان، شوفێری تەکسی بووم. داهاتی مانگانەم (400000) دیناری نوێ (نزیکەی 265$) بوو.. هۆی ئەوەی کە هاتوومەتە ناو زیندان، بەکارهێنانی ماددە هۆشبەرەکان بوو لە بنەسلاوە.. یەکەمجار کە بە کارم هێنا بەر لە (1) ساڵ پێش بوو کە بەهۆی برام (واتە حالەتی پێنجەم) فێری مادده هۆشبەرەکان بووم.. مەبەستی سەرەکیم لە بەکارهێنانی زیاتر حەزی سێکسی بوو.. پێش لە مادده هۆشبەرەکانیش ((جگەرەم)) بەکار نەدەهێنا.. ئێستاش ((تریاك)) بەکار دەبەم.. لە ڕێگای کێشان.. مانگانە نزیکەی (135000) تومان (150$)م بە تریاك دەدا.. دەمزانی کە بەکارهێنانی ئەم جۆرە مەوادده دەبێتە هۆی خووپێوەگرتن بوونم، تەنانەت دەمزانی کە ئاسەوار و دەرەنجامەکانی ئەوەندە نێگەتیڤی و زەرەرمەندن.. پەیوەندی کۆمەڵایەتیم لەگەڵ دایك و باوکم و لەگەڵ هاوسەرەکەم باش بوو، بەڵام لە دوای خووپێوەگرتن بوونم، بەردەوام لە گەڵ خێزانم شەڕ و کێشەم هەبوو، جارێك خێزانم (30) حەبی خوارد لە داخی من!.. خێزانی ئێمە لە ڕووی ئاینییەوە زۆر پابەند نەبوون. من هیچ ئاگاداری ئەوە نەبووم کە ئایین ڕێگرە لە بەردەم بەکارهێنانی

مادده هۆشبەرەکان، واته ئەمدەزانی ئیسلام حەرامی کردووە و بۆ مـن گـرنگ نەبوو بزانم رای ئاین چییە.. بەڵام دەمزانی کە شتێکی نایاساییە و ئەگـەر بێتـو ئاشکرا بم، دەمگرن!.. دەست بەتاڵی خـۆم زیـاتر بـە گـەڕان و تەماشـا کردنـی سەتەلایت پڕ دەکردەوە، ئێستاش زۆر پەشیمانم!.. بۆ ئەوەی خەڵکانی دیکـە بـە تایبەتی گەنجەکان وەکو من تووش نەبن، پێیان دەڵێم:

★ شوێنێك بۆ ئەوانە (خووگرتووەکان) دابینبکرێت بۆ ئەوی متمانە دروست ببێت لە نێوان حکومەت و خووگرتووەکان، چونکە زۆربەیان پەشیمانن، بەڵام لە ترسـی پولیس ناهێن خۆیان بدەن بەدەستەوە بکەن.

## 2- دەرەنجامەکان و پێشنیارەکان

لێرە هەوڵ دەدەین، لێکۆڵینەوە لە بارەکان شی بکەینـەوە، واتـە هـەوڵ دەدەیـن هۆکارەکـانی تـووش بوونیـان دەسـت نیـشان بکـەین، دواتـر پێـشنیارەکان و راسپاردەکانی خۆمان وەکو چارەسەری ئەم کێشەیە دەخەینە روو:

### 1- دەرەنجامەکان

- هۆی سەرەکی تووش بوونی ئەم گەنجانە بـۆ ئێـشتەجێبوونیان لـە ((ئێـران)) دەگەڕێتەوە، بە حوکمی ئەوەی ئاوارەی ئێران بـوون. ئێـرانیش - هـەر وەك دەزانین - وڵاتێکە کە رێژەی خووگرتووەکـان لـە هـەموو شـارەکانی دا بـە تایبەتی شارەگەورەکانی وەکو: تاران، اصفهان، شیراز، ورمێ (ارومیە) و... (کە زۆربەی ئەم گەنجانە لەم شارانە دا نیشتەجێ بوون) زۆرە و هـەموو جـۆر مەوادی مادده هۆشبەرەکانیش لە ئێران بە دەست دەکەوێ.

- ئەمانە کە لە ئێران تووش بوون، زۆربەیان ئەو کەسانەن کە لە گەڕانـەوە بـۆ کوردستان دواکەوتن (واتـە لـە دوای سـاڵی 2000وە گەڕاونەتـەوە)، کەچـی

ئەوانەی کە زووتر هاتوونەوە، وەکو ئەوان تووش نەبوونە. چونکە پێشتر لە هەموو شارێك کە ئاوارەکانی کورد تێدا نیشتەجێبوون، بە حوکمی ئەوەی کۆمەڵگایەکی خۆجێی (Community) یان پێك دەهێنا، پەیوەندی دەروونی ـ کۆمەڵایەتی نێویان دا زۆر پتەو و بەهێز بوو، ئینتیمایان بۆ یەکتر زۆر بوو، خۆیان بە نسبەت ئێرانییەکان بە بێگانە دەزانی و...، بەڵام وردە وردە لەگەڵ گەڕانەوەی ئاوارەکانی کورد ڕێژەی ئەوانەی کە نەهاتنەوە، ڕۆژ بە ڕۆژ کەمتر دەبوو، بۆیەش ئەو کۆمەڵگا خۆجێیەکان هەڵوەشا و وەکو پێشتر ئەما و هەر یەك لە گەڕەکێك بڵاوبوونەوە و پەیوەندییەکانیشیان لەگەڵ یەکتر ڕۆژ بە ڕۆژ لاوازتر بوو، زیاتر لەگەڵ ئێرانییەکان تێکەڵ بوون و برادەرەکانی ئێرانی بوونە جێگرەوەی خزم و برادەری کورد. ئەوەش بوە هۆی وەرگرتنی دابونەریت و فەرهەنگی ئێرانیەکان و لە کۆتایی دا تووشی ماددە هۆشبەرەکانیش بوون. ئێستاش کە ئەم خووگرتووانە گەڕاونەتەوە بۆ کوردستان هەست بە نامۆ بوونی خۆیان دەکەن! تەنانەت کاتێ چاوپێکەوتنمان لەگەڵیان، وەکو ئێرانیەکان دەهاتنە پێش چاومان و خووگرتووەکانی ئێرانیمان بە بیر دەهاتەوە! قسەکان و هەڵسوکەوت و تەبریراتی ئێرانییانەیان هەبوو!!

- هەموویان پیاو بوون و گەنجیش بوون.. گەورەترینیان (34) ساڵ و بچووکترینیان (23) ساڵ بوو.

- بۆمان دەرکەوت زۆربەی ئەوانە خووگرتوون، لە هەر دوو قەزای ((دیانا)) و ((بنەسلاوە)) نیشتەجێن کە زۆربەی کوردە ئاوارەکانی کە لە ئێران گەڕاونەتەوە، لەو دوو قەزایە دادەنیشن.

- هۆی تووش بوونی هەموویان دەگەڕاوە بۆ ((بوونی برادەری خووگرتوو)) و هاتوچۆکردن لەگەڵیان. هەندێکیشیان جگە لەوە باس لە ((ئارەزووی سێکسی)) (Sexual) و ((ئارەزووی زانین و فزولییەت)) (Curiosity)یان دەکرد.

- له وه‌ڵامه‌كانیاندا بۆمان ده‌ركه‌وت كه‌ خێزانی ئه‌وان، خێزانێكی شپرزه‌ن و هه‌ست به‌ به‌رپرسیارێتی ناكه‌ن. چونكه‌ دایك و باوكیان بـه‌ هـۆی چـاودێری نه‌كردنی پێویست و شێوازی گونجاوی په‌روه‌رده‌كردن، هه‌ر یه‌ك لـه‌و گه‌نجانـه‌ وازیـان لـه‌ قوتابخانـه‌ هێنـاوه‌ و هـیچ كـام لـه‌وان لـه‌ ئاسـتێكی بـه‌رزی خوێنده‌واریدا نه‌بوون. به‌رزترینیان قۆناغی ((ناوه‌ندی)) ته‌واو كردبوو! كه‌واته‌ ئاستی لاوازی رۆشنبیری و فه‌رهه‌نگیش كاریگه‌ری هه‌یه‌.

- هه‌موویان له‌ بواری ئابووریدا بێئاگا بوون به‌ تایبـه‌تی لـه‌ داهـات و خـه‌رجی خۆیان كه‌ به‌شێكی زۆری داهاتیان بۆ كڕینی ئه‌و مه‌وادانه‌ تـه‌رخان كـردووه‌.. هه‌روه‌ها له‌ رووی ئابوورییه‌وه‌، ده‌كرێ بڵێین له‌ ئاستی ناوه‌ند یا خود نزیـك لـه‌ ناوه‌ند بوون، چونكه‌ زۆربه‌یان هێشتا كرێ چین و داهاتی ئه‌وتۆشیان نه‌بوو.

- زۆربه‌یان زه‌مینه‌ی مادده‌ هۆشبه‌ره‌كانیان هـه‌بوو، بـه‌ حـوكمی ئـه‌وه‌ی كـه‌ ((جگه‌ره‌كێش)) بوون. پێمان وایه‌ ((جگه‌ره‌)) - كه‌ خۆی جۆرێكه‌ له‌ مـادده‌ هۆشبه‌ره‌كانی مۆڵه‌ت پێدراو - هـه‌نگاوی یه‌كـه‌می مـادده‌ هۆشـبه‌ره‌كانی تره‌، وه‌كو تریاك و هرونین و خورادنه‌وه‌ رۆحییه‌كان!

- هۆیه‌كی تر بریتییه‌ لـه‌ ((نـه‌بوونی هوشـیاری)) پێویـست لـه‌ سـه‌ر مـادده‌ هۆشـبه‌ره‌كان. زۆربـه‌یان ده‌یـانگووت كـه‌ ئاگـاداری ئاسـه‌وار و ده‌ره‌نجامـه‌ نێگه‌تیڤییه‌كانی مادده‌ هۆشبه‌ره‌كان نه‌بووین!

- پێمان وایه‌ ئه‌وانه‌ی كه‌ لایه‌نی ئـایینی و مه‌عنـه‌وی و رۆحییـان (Spiritual) لاوازه‌، كه‌متر خۆڕاده‌گرن به‌رامبه‌ر كێشه‌كانی ژیان و زیاتر پـه‌نا ده‌به‌نـه‌ بـه‌ر مادده‌یات و ئامرازی ماددی كه‌ یه‌كێك له‌وان ((مادده‌ هۆشبه‌ره‌كان))ه‌. بۆیه‌ش ده‌بینین كه‌ زۆربه‌یان ته‌نانه‌ت خێزانه‌كانیان (ئه‌و شـوێنه‌ی كـه‌ تێـدا پـه‌روه‌رده‌ كراون) له‌ رووی ئایینییه‌وه‌ لاواز بوون و پابه‌ندی و ئایینیان كه‌م بوو.

- نه‌بوونی ((هوشـیاری ئـایینی)) كـه‌ ئـه‌م ئه‌ركـه‌ زیـاتر لـه‌ سـه‌ر ئه‌سـتۆی ماموستایانی ئایینیه‌، بۆ بڵاو كردنه‌وه‌ی هوشیاری ئایینی. چـونكه‌ ئـایینی

ئیسلام ریگره و دژی هەموو جۆر ماددە هۆشبەرەکانێکە و بە زیانی تـاك و کۆمەڵگا دەزانێ. هەر وەك دەبینین هیچ یەك لەو گەنجانـە نمیانـدەزانی کـە ئاین، ماددە هۆشبەرەکان بە حرام دەزانێ.

- زۆربەیان دانیان بەوە دادەنا کە پەیوەندییان لەگەڵ خێزانەکانیان باش نـەبوو، بە تایبەتی ئەوانەی کە خێزاندار بـوون، تەنانـەت نموونـەی واش هـەبوو کـە هاوسەرەکەیان لە خەفەتی ئەوان هەوڵی خۆکوژییان داوە!

- هەموویان دەیانزانی کە مـاددە هۆشـبەرەکان شـتێکی نایاسـاییە و ئەگـەر ئاشکرا بن دەگیرێن، کەچی سەرەڕای ئەوەش هەر بەکاریان دەهێنـا! کەواتـە ئەوانەی کە تاکی خووگرتوو بە نەخۆش لەقەڵـەم دەدەن، نـەك ((تاوانبـار))، پێمان وایە بۆچوونیان دروست نیە و لـە وەڵامـی ئـەوان دا دەڵـێین: ((تـاکی خووگرتوو، تاوانبارێکی نەخۆشە))!!.

- زۆربەی ئەوان کاتی دەست بەتاڵی خۆیـان زیـاتر بـە دیتنـی سـەتەلایت پـڕ دەکردەوە لە جیاتی وەرزش کردن یان خوێندنەوە یا کارێکی تری پۆزەتیڤی!

- هەموویان لە رووی جەستەیی و رواڵەتەوە بە تاکێکی ئاسایی نەدەچوون، بـە شێوەیەك هەندێکیان ئەوەندە بێهێز ببون کە دەست و باڵیان بگرن تا بتوانن بەرێوە بچن!

- لە رووی دەروونییەوە هەموویان تووشی خەمۆکی، دڵەڕاوکێ و سـایکۆپاتیك و پەستبوون و خۆ بە کەم زانین ببوون.

- هەندێکیان بە گریان وەڵامی پرسیارەکانیان دەدایەوە، کـە نیـشانەی لاوازی ئیرادە و بێئومێدی و پەشێمانی لەرادەبەرە!

- پێشنیارەکانیان زیاتر ئەوە بوو کە: خەڵك ئاگاداری خـۆی و منداڵـەکانیان بـن. حکومەت سەختگیری لەبەرامبەر ئەوان بەکار بهات و پشتگوێیان نەکات و...!

## 2- پێشنیارەکان (چارەسەری)

پێمان وایە کوردستان جگە لە مەترسی ((تیرۆر))، ئێستا ماددە هۆشبەرەکانیش هەرەشەی لێی دەکات و پێویستە هاوکات لەگەڵ بەرەنگاریکردنی تیرۆر، لە هەموو ڕێگایەکەوە بەرەنگاری دیاردەی ((ماددە هۆشبەرەکانیش)) بکرێ.

لەگەڵ ئەوەی لە زۆر لە وولاتاندا بەرەنگاری کردنی بەردەوام دژی ماددە هۆشبەرەکان هەبووە، بەلاّم ئەنجامێکی باشی و یەکلاکەرەوەیان بەدەست نەهێناوە و ڕۆژ بە ڕۆژ ژمارەی خووگرتووەکان بەتایبەتی لە نێو گەنجەکاندا زیاتر دەبێت! هۆکارەکانی سەرنەکەوتنی بەرنامەکانی بەرەنگاریکردنی ماددە هۆشبەرەکان، دەتوانین بەم جۆرە بژمێرین:

**یەکەم**: شێوازی بەرەنگاربوونەوەیان دروست نەبووە، بە تایبەتی لە ناو زیندانەکاندا.

**دووەم**: شێوازی ژیان و بارودۆخی کۆمەلاّیەتی و ژینگەیی بە شێوەك بووە کە زەمینەی تووش بوونی دووبارەیان ڕەخساندووە[85]. واتە لە دوای دەرچوون لە زیندان و شوێنە چاکسازییەکان دیسان دەگەڕێنەوە بۆ لای ماددە هۆشبەرەکان و برادەرەکانی پێشوویان!

بەرنامەی بەرەنگاربوونەوە نابێت تەنیا بە دووبارە توانا بەخشینەوە بە خووگرتووەکان ببەسترێتەوە. توانا بەخشینەوە بەشێکە لە بەرنامەکە. بەرەنگاربوونەوەی هەمەلایەنەی کەسایەتی، کۆمەلاّیەتی و فەرهەنگی پێویستە تاکو ماددە هۆشبەرەکان و خووپێوەگرتن بنبڕ بکرێت.. تا ئەو کاتە کە زەمینەی کۆمەلاّیەتی خووپێوەگرتن لە ناو نەچێت و کەسەکان لەلایەنی کەسایەتی نەگەنە سەربەخۆیی و دووبارە دۆزینەوەی بەهاخودییەکان، خووپێوەگرتن بنبڕ نابێت. (واتە بنبڕ کردنی وابەستەیی دەروونی بە ماددە هۆشبەرەکان).

---

85. أحمدی، سەرچاوە پێشوو، ل204 تا 206.

ئامـانجی سـەرەکی بەرنامـەی بـەرەنگاری کـردن لەگـەڵ خووپێـوەگرتن دەبـێ خۆپاراستن و بەرەنگارکردنی ئەوانە بێت کە دەکەونـە داوی مـادە هۆشـبەرەکان. ئەم بەرەنگاربوونەوەش کاتێك سەردەکەوێت کە:

1- جەخت لە سەر ((خۆپاراستن)) (الوقاية/ Prevention) بکات.
2- زەمینەی ئابووری، کۆمەڵایەتی و سیاسی بۆ خووپێوەگرتن لە ناو ببات.
3- پەیوەندی خێزانی دروست بکرێنەوە.
4- بەرنامەی بۆ دووبارە توانا بەخشینەوە و چارەسـەری کردنـی خووگرتووەکـان هەبێت.

**لێرە باس لە هەندێ هەنگاوی پێویست لە پێناو خۆپاراستن لـە دیـاردەی مادده هۆشبەرەکان و خووپێوەگرتن دەکەین:**

- بۆ ئەم مەبەستە دەبێ کار بۆ روون کردنەوەی بـیری خـەڵك و دروسـت کردنـی ((هوشیاری)) پێویست و گونجـاو بـۆ خـەڵك بکرێـت و مەترسـییەکانی مـادە هۆشبەرەکان دەستنیشان بکرێن.. لێرە ئەرکی دەسەڵات، سیستەمی فێرکردن، ئامرازی راگەیاندن، ماموستایانی ئایینی و دایـك و باوکـان و... هـەموویان دیار دەبێت.
- رێگە لە دابەشکردن و بڵاوکردنـەوەی مـادە هۆشـبەرەکان بگیرێـت. بـۆ ئـەم مەبەستەش یاسا و لایەنەپەیوەندارەکان دەوری سەرەکی دەبێ ببینن.
- هەنگاو بۆ دابین کردنی پیشە و داهات و لاوان بنرێـت. زەمینـە بـۆ تەندروسـتی دەروونی لاوان دروست بکرێت، لە رێگای کردنەوەی وەرزشگای زیاتر و پەرەپێدانی روحی وەرزش و بەرنامەی بەشی راگەیاندن بە تایبەت لە بواری ئەخلاقی و پێوەرە کۆمەڵایەتییەکان، تا بگەنە رادەیەك کە توانای پێـشبینی داهاتوویـان هـەبێت و پەیوەندییەکانیان لەگەڵ کۆمەڵگا و بنەماڵە دروست بکرێتەوە.

- بوونی یاسایەکی توندی تایبەت بە دژە ماددە هۆشبەرەکان کە ڕێگر بێت لە گواستنەوە و مامەڵەکردن و بەکارهێنانی ماددە هۆشبەرەکان. کە ئەمەش ئەرکی دەزگا پەیوەندارەکانە بە تایبەتی پەرلەمانی کوردستان.

- دروستکردنی بزووتنەوەیەکی گشتی بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئەم دیاردەیە ماڵ وێرانکەرە. دەبێ ئەمە ئەرکی هەموو کەس بێت و بە ئەرکێکی سیاسی، کۆمەڵایەتی، نەتەوەیی و ئایینی و ڕیکلامی بێتە ژمار. هەروەکو پێشتر باسمان کرد خووپێوەگرتن تاوان و نەخۆشییەکی درمە (واتە دەگوازرێتەوە و بە ماوەیەکی کەم، ژمارەیەکی زۆر تووش دەکات)، لە وڵاتێك وەکو وڵاتی ئێمە کە ماددە هۆشبەرەکان بە ئاسانی بە دەست دێت بە حوکمی ئەوەی دراوسێ ئێرانین، کاتێك دەتوانین بەرگری لە بڵاوبوونەوەی بکەین کە بزووتنەوەیەکی گشتی بۆ بکرێت.

- هاوکات لەگەڵ بەرەنگاربونەوەی هەمەلایەنە و گشتی، پێویستە کە ((فەرهەنگی خووپێوەگرتن)) لە ناو بچێت و بوار نەدرێت ئەم جۆرە کوولتورە دروست ببێت و بڵاو ببێتەوە. مەبەستمان لە فەرهەنگ و کولتووری خووپێوەگرتن بریتییە لە: ریکلامی ناراست لە ڕێگەی بڕادەران و خووگرتووەکان لە بارەی باش بوونی هەندێك لە ماددە هۆشبەرەکانە. کەچی خووپێوەگرتن بەڵایەکی کۆمەڵایەتییە. ئەگەر ماددە هۆشبەرەکان بە دەست کەسەکان نەگات، یان کولتووری خووپێوەگرتن لە ڕێی بڕادەری خووگرتوو بۆیان نەگوازرێتەوە، ئەو کەسانە ناکەونە داوی ماددە هۆشبەرەکان.

- هەروەها نابێ لە بۆشایی مەعنەوی و هەست بە بێ مانایی بێ ئاگا بین. ئەگەر کۆمەڵگا بە دوای ئامانجێکی روون نەبێت و تاکە کەس بەرەو ئایدیالی مرۆڤی و پێشکەوتوویی نەبات، ئەوان هەست بە پوچی دەکەن و پەنا بۆ جیهانی خەیاڵ و ماخولیای ماددە هۆشبەرەکان دەبەن.

- ڕاستە کە سیاسەتی داگیرکەران لە نێو وڵاتانی جیهانی سێیەمدا، هەروەها وولاتانی دژ بە نەتەوەکەمان لەگەڵ جۆرێك داگیرکەری هزری و پاشکۆیی هاوڕێیە و بڵاوکردنەوەی ماددە هۆشبەرەکان و تووشکردنی کەسەکانی ئەو کۆمەڵگایە بە

مادده هۆشبەرەکان هەنگاوێکە بۆ پاشکۆکردنی هزری و شکاندنی ئەوانە، بەڵام تا چ رادەیەك ئێمە دژە ژەهرمان بۆ ئەو ژەهرەی ئەوان دۆزیوەتەوە؟

- بارودۆخی ئاڵۆز و تێکەڵ و پێکەڵی کۆمەڵایەتی و ئابووری و نەبونی پێوەری دیار و نەبوونی رێ و شوێن و ئامانجێکی روون لە ژیاندا کە خەریکە ژیانی ئێمەی بگرێتەوە (واتە: Social anomy)، هۆکاری گەلێکی باشن بۆ ئەوەی گەنجەکانمان بەرەو مادده هۆشبەرەکان برۆن. ئەگەر کۆمەڵگا لاوان وەکو خۆیان رەها بکات و رێ و شوێنێکی دروستیان بۆ ئامادە نەکات و بەرنامەی شیاوی بۆ کاتی بێ کاری و دەست بەتاڵی ئەوان پێشبینی نەکات و لە تەواوی قۆناغەکانی گەشەکردنیاندا، رێنوێنی و رێگاپیشاندەری ئەوان نەبێت، بە کردەوە زەمینەیان بۆ تووشبوونیان رەخساندووە. ئەرکی کۆمەڵگایە هەموو لایەنێك رەچاو بکات و لە ئەرکی گەورەی خۆی بێ ئاگا نەبێت و بشزانێت کە چ بە لاوان دەدات و چاوەڕوانی چی لێیان هەیە. بە بێ پلانێکی دروست و گونجاو، نابێ چاوەڕوانی پێشکەوتن و پێگەیشتن لە لاوان بکرێت!

- ((خێزان)) گرنگترین سەرچاوە و سەرپەنایە بۆ لاوان. ئەو خێزانانەی کە شپرزەن، منداڵەکانیان لە خۆ دوور دەکەنەوە کاتێك کە دایك و باوك جێی پشت بەستن و متمانەی منداڵەکانیان نەبن، ئەوان یان روو لە برادەر دەکەن یان دوور دەکەونەوە، لە هەردوو شێوەدا لەوانەیە بکەونە داوی مادده هۆشبەرەکان و تاوانەکانی تر. هەندێك لە بنەماڵەکان ئەوەندە سەرقاڵی کێشەی ماددی و خۆدی خۆیانن کە پەیوەندیان لەگەڵ منداڵەکانیان دەگاتە نزمترین ئاستی خۆی. ئەندامەکانی خێزان هەست بە دابڕان لە بنەماڵە دەکەن، وەکو ئەوە وایە کە کەسانێکی بێگانەن کە لەناو یەك ماڵدا دەژین. لە ژیانی خووگرتووەکاندا ئەو جۆرە پەیوەندییە نێگەتیڤییە زۆر دەبینین. کەواتە بۆ ئەوەی منداڵان لە داوی مادده هۆشبەرەکان و تاوانەکانی تر نەکەون، دەبێ پەیوەندییەکان لە ناو خێزان کراوە و پۆزەتیڤی بن. بنەماڵە زۆرترین ئەرکی لەدروست کردنی کەسایەتییەکی سەرەبەخۆیی ئەندامەکانی خۆی هەیە و دەتوانێت رۆڵێکی

گرنگی لە پێکەوە گونجانی دروستی منالآندا هەبێت، هەڵبەت ئەوە ئەرکێکی سادە نییە. بە وتەی ((ساتیر)) (Satir): ((دایکان و باوکان لە دژوارترین و پرکێشەترین قوتابخانەی دونیا بۆ دروست کردنی مرۆڤ خەریکی وانەگوتنەوەن... قوتابخانەیەك کە بەڕێوەبەر، مامۆستا و خزمەتگوزارەکەی هەر خۆیانن و پشوودان و بەرزبوونەوەی مووچەیان نییە... قوتابخانەیەکی کە 24 کاتژمێر و 365 رۆژ، کە لایەنی کەم 18 ساڵ لە خزمەتی هەر منالێك دان... سەرەڕای ئەوە قوتابخانەیەك کە دوو بەڕێوەبەری هەبێت، دەزانین کە چ کێشەیەك دروست دەکات، ئەو ئەرکە، دژوارترین و ناڵۆزترین پڕ دڵەڕاوکێترین و پڕ زەحمەت ترین کارە و پێویستی بە بەرزترین ناستی توانا، لێبوردن، خۆش خولقی، کارزانی خوشەویستی، ئاگاداری و زانست هەیە و...)) ساتیر، وتەکەی درێژە دەدات و دەڵێت: ((ئەگەر بینینتان کە کێشەیەك لە ناو خێزانتان دا هەیە، ئەوە بکەن کە کاتێك گلوپی سووری سیارەکەتان بە نیشانەی گەرم بوون (هەستانی حەماوە!) پێدەبێت و ئێوە لێی دەکۆڵنەوە، بۆ ئەوەی بزانن چی دەتوانن لەگەڵی بکەن و ئەگەر خۆتان نەتوانن چاکی بکەنەوە لە کەسێکی باوەڕپێکراو یارمەتی دەخوازن، هەر بەو شێوەیە خۆتان تێك مەدەن و فێر بن چ بکەن تا پەیوەندییە بنەماڵەییەکانتان باشتر بێت))[86].

- بەرەنگارکردنی خووپێوەگرتن کاتێك تەواو دەبێت کە پلان بۆ وازهێنان و دووبارە توانا بەخشین بە خووگرتووەکان هەبێت. ئەوەش بە خێرایی نابێت بەڵکو چەند قۆناغێك لە خۆ دەگرێت. پلانەکە نابێت لە سێ چوار حەفتە ئەنجام ببێت و ئەگەر کتو پڕ نەبێت و خووگرتووەکە بۆ ژیانی ئاسایی و دروست کردنەوەی کەسایەتی نەباتن، ئەگەری گەڕانەوەی بۆ خووپێوەگرتن زۆرە[87].

---

86. ساتیر (ارنست): آدم سازی، ترجمەی بیوشك ـ نشر ماهلن، تهران1377، ل243 تا 251.

87 . لێرە مەجالی باسکردن لەو قۆناغانە نابینین، بۆ ئەم مەبەستە بڕوانە: فرجاد، سەرچاوەی پێشوو، ل164 تا 166.

# سەرچاوەکان

## یەکەم: سەرچاوە عەربیەکان:


1. أبو الروس (أحمد): مشكلة المخدرات و الادمان ـ المكتب الجامعي الحديث، الاسكندريه 2003، الطبعة الاولى.
2. ابن تيمية: الفتاوى الكبرى، دار الكتب الحديثة، الجزء الرابع، بدون تاريخ.
3. ابن رشد القرطبي: بداية المجتهد و نهاية المقتصد،، مطبعة صبيح، الجزء الاول، بدون تاريخ.
4. ابن ماجه: سنن، تحقيق محمد فؤاد عبدالباقي، دار احياء الكتب العربية (1373 هـ) الجزء الثاني.
5. امام شافعي، كتاب الام، المطبعة الاميرية ( 1321 هـ )، الجزء الثاني.
6. امام مسلم: صحيح، مطبوعات صبيح، الجزء السادس، بدون تاريخ.
7. الحطاب: شرح الحطاب على مختصر خليل، الجزء الثاني، بدون تاريخ.
8. الدردير: حاشية الدسوقي علي الشرح الكبير، الجزء الرابع، بدون تاريخ.
9. الرازي: تفسير الرازي، المطبعة العادية (1308)، الجزء الثاني.
10. الرفاعي (د. أحمد حسين): مناهج البحث العلمي - دار وائل، عمان1999، الطبعة الاولى.
11. الزرقاني: شرح موطأ امام مالك، الجزء الرابع، بدون تاريخ.
12. شعبان (د. صباح كرم): جرائم المخدرات - المنصور، بغداد1984، الطبعة الاولى.
13. عياد (سمير): المخدرات سلاح الاستعمار و الرجعية - دارالكتب العربي للطباعة و النشر1967، الطبعة الاولى.

14. العيسوى (د. عبدالرحمن محمد): المخدرات و أخطارها - دارالفكر الجامعي، الاسكندرية 2005، الطبعة الاولى.

15. القرغولى (ثامر عبدالهادى): المخدرات ـ بغداد (بدون تاريخ).

16. المغربى (د. سعد): ظاهرة تعاطى الحشيش - دار الراتب الجامعية، بيروت1984، الطبعة الثانية.

17. ناصف (شيخ على منصور): التاج للأصول في أحاديث الرسول، الجزء الثالث، الطبعة الثانية، بدون تاريخ.

## دووەم: سەرچاوە فارسييەكان

1. أبادينسكى (هووارد): جامعه شناسى مواد مخدر، ترجمەى محمد على زكريايى - ستاد مبارزه با مواد مخدر، تهران1382، چاپ اول.

2. أحمدى (د. سيد أحمد): روانشناسى نوجوانان و جوانان - انتشارات مشعل، اصفهان 1383، چاپ يازدهم.

3. أردوباى (على): اعتياد بلاى قرن بيستم - نشر گنجينه، تهران 1378، چاپ اول.

4. أردوباى (على): جوانان و مواد توهم زا - آواى نور، تهران 1382، چاپ دوم.

5. أردوباى (على): گسترش جهانى اعتياد - انتشارات كيهان، تهران1379، چاپ اول.

6. برومند (د. شهزاد): بررسى اقتصادى رفتار مصرف كنندگان مواد مخدر- ستاد مبارزه با مواد مخدر، تهران1383، چاپ اول.

7. بوسار(آندره): بزهكارى بين المللى، ترجمەى نگار رخشانى - انتشارات كتابخانەى گنج دانش، تهران1375، چاپ اول.

8. دانش (تاج زمان): مجرم كيست، جرم شناسى چيست؟- انتشارات كيهان، تهران1384، چاپ دهم.

9. دی واس (دی. ای): پیمایش در تحقیقات اجتماعی، ترجمه‌ی هوشنگ نایبی - نشرنی، تهران 1383، چاپ پنجم.

10. ساتیر (ارنست): آدم سازی، ترجمه‌ی بیرشك - نشر ماهان، تهران1377، چاپ اول.

11. ساعی (بهروز): بررسی علل گرایش معتادان به مواد مخدر، پایان نامه‌ی کارشناسی ارشد، دانشکده‌ی علوم اجتماعی و تعاون، تهران1370، چاپ اول.

12. ستوده (د. هدایت الله): آسیب شناسی اجتماعی - انتشارات آوای نور، تهران1384، چاپ یازدهم.

13. سرمد (د. زهره) و نموانی تر: روشهای تحقیق در علوم رفتاری - نشر آگه، تهران1383، چاپ نهم.

14. شفرز (برنهارد): مبانی جامعه شناسی جوانان، ترجمه‌ی کرامت الله راسخ - نشر نی، تهران 1383، چاپ دوم.

15. صفری (فاطمه): اعتیاد و زنان، تفاوتهای جنسیتی در زمینه‌ی سوء مصرف مواد و درمان آن - ستاد مبارزه با مواد مخدر، تهران1381، چاپ اول.

16. عظیمی (د.محمد): مباحث اساسي روانشناسي - انتشارات کیهان، تهران 1380، ضاث اول.

17. فدایی (فرید) و سجادیه (د. سید محمد علی): شناخت و پیشگیری و درمان اعتیاد - نشر تایماز، تهران 1365، چاپ اول.

18. فرانکفورد (چاوا) و نچمیاس (دیوید): روشهای پژوهش در علوم اجتماعی، ترجمه‌ی د.فاضل لاریجانی و نموانی تر، انتشارات سروش، تهران 1381، چاپ اول.

19. فرجاد (د. محمد حسین): آسیب شناسی کجرویهای اجتماعی - انتشارات قوه‌ی قضائیه، تهران1383، چاپ نهم.

20. کریم پور (صادق): روانشناسی اعتیاد - نشر اندیشه، تهران 1365، چاپ اول.

21. گورین (کوزه): تشخیص بیماریهای روانی، ترجمهی پورأفکاری - انتشارات گنجینه، تهران 1379، چاپ اول.

22. هاشمی (د. علی): مواد مخدر: بحران اجتماعی و تهدید علیه امنیت ملی - ستاد مبارزه با مواد مخدر، تهران 1382، چاپ اول.

## سێیەم: مقالاتی ئینترنێتی

1. آزمون (علي): سبب شناسي اعتياد -مجله ی اجتماع درمان مدار، سال دوم، شماره ی 3، بهار 1384. له سایتی: http//www.google

2. تقی زاده (داریوش): اعتیاد، علل، پیشگیری و درمان - مجلهی اجتماع درمان مدار، سال دوم، شماره 3، بهار1384. له سایتی: http//www.google

3. حسینی زاهدی (سید ولی): مقالهی ((اعتیاد و جوانان)) - سایتی: ((اطلاع رسانی نیروی انتظامی جمهوری اسلامی ایران)): http://www.police.ir/druqs/avarez.htm

4. مولوی (فاطمه): نگاهی به آسیب شناسی اعتیاد -سایتی ئینترنێتی: http:// www.dchq.ir

5. نارنجی ها (د. هومن): علل گرایش به سوء مصرف مواد مخدر- سایتی ئینترنێتی:

http:// www.dchq.ir

6. یزدانی (د. غلامرضا): ((اعتیاد چیست؟)) -سایتی: ((اطلاع رسانی نیروی انتظامی جمهوری اسلامی ایران)): http://www.police.ir/druqs/avarez.htm

# پاشکۆ

**نموونەیەك لە پرسیارەكانی چاوپێكەوتن لەگەڵ خووگرتووەكانی گیراو لە ((ئاسایشی گشتی هەولێر)):**

1. **تەمەن:( ) ساڵ**
2. **باری كۆمەڵایەتی: ( )**
3. **شوێنی نیشتەجێبوونی پێشوو:**
4. **شوێنی نیشتەجێبوونی ئێستا:**
5. **جۆری نیشتەجێبوون (كرێ یان موڵك):**
6. **ئاستی خوێندەواری:**
7. **جۆری پیشە پێش هاتن بۆ زیندان: ( ).**
8. **داهاتی مانگانە بە دینار: ( ) دینار.**
9. **یەكەم جار لە كوێ بە كارت هێنا.**
10. **لە چ تەمەنێك دا بوویت؟ ( ) ساڵ**
11. **چەند برادەرت هەیە كە ماددە هۆشبەرەكانیان بەكار دەهێنا؟ ( ) برادەر**
12. **چۆن فێر بوویت؟**
13. **یەكەم جار بە چ مەبەستێك بە كارت هێنا؟**
14. **پێش لە ماددە هۆشبەرەكان جگەرەت بە كار دەهێنا؟**

15. ئەگەر بەڵێ ڕۆژانە چەند دانە؟(     ) دانە

16. چ مواددێك زیاتر بە كار دەهێنی؟

17. چۆن بە كار دەهێنی؟ واتە ئامرازی بە كارهێنانت چییە؟

18. ئەو مواددەی كە بە كار دەهێنی، مانگانە چەند پارەت پێدەدا؟

19. ئایا دەتزانی كە بەكارهێنانی ئەم جۆرە موادده دەبێتە هۆی ئیدمان بوونت؟

20. ئایا هیچ ئاگاداری ئاسەوار و دەرئەنجامەكانی مادده هۆشبەرەكان بوویت؟

21. پەیوەندی كۆمەڵایەتی لە ناو خێزاندا بە چ شێوەیەكە؟

22. ئەگەر خراپە لەگەڵ چ كەسێك زیاتر؟

23. خێزانت تا چەند پابەندن بە ئایین؟

24. تا چەند ئاگاداری كە ئایین ڕێگرە لە بەردەم بەكارهێنانی مادده هۆشبەرەكان؟

25. باوەڕت هەیە كە مادده هۆشبەرەكان شتێكی نا قانونی و زیانمەندە؟

26. فەراغی خۆت چون پڕ دەكەیتەوە؟

27. ئایا پەشیمانیت لەو كارە؟

28. بە ڕای تۆ چی بكرێ باشە بۆ ئەوەی كەسانی تر وەكو ئێوە تووش نەبن؟